یەکەمین گۆڤاری کارگێری و گەشەپێدانی مرۆیی
لە کوردستاندا

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێری و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی سێیەم -تەمووزی 2010

## گەورەترین سەرکەوتن!!

## هەڵپەی سامان
## و
## نەمانی خۆشەویستی!

## لێپرسراوێتی کۆمەڵایەتی کۆمپانیا تایبەتەکان

## فەلسەفەی کاری دامەزراوەیی و تایبەتمەندییەکانی

## وەرزەکانی خۆشەویستیی ژیانی هاوسەرێتی

The first Magazin Especializined in Management
and Human Development in Kurdistan

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی سێیەم - ژمارە 26 - تەمموزی 2010



بەشی ڕیکلام
07480112787

حساب بانکی گۆڤار
بانکی کوردستانی نێودەوڵەتی سلێمانی 3371



بۆ دابەشکردنی بڕیار

هەولێر: خانەی سیروان ۰۷۵۰٤٦۷۲۹٦۳
کەرکوک: ۰۷۷۰۸٥٦۳۷۲٤ هەڵەبجە: ۰۷۷۰۱۹۳۳۹٦۷ -۰۷۵۰۱۱۲۹٤۳۷
دەربەندیخان: ۰۷۷۰۱٥۸۱۰۱۸ کفری: ۰۷۷۰۱٥٦٦۸۷٦ کەلار: ۰۷۷۰۲۱۰۱۲۸۸
چەمچەماڵ: ۰۷۷۰۸٥٥۰٥۸٦ کۆیە: ۰۷۷۰۱٥٤۹۷۱٤ سۆران: ۰۷٥۰٤٥۰۱۹۳۳
چۆمان: ۰۷٥۰٤٥٦۷۹۹۲ قەڵادزێ: ۰۷۷۰۱٥۸٥۲۰۱ ڕانیە: ۰۷۷۰۱٥۸۰٤٤۲

ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری سلێمانی مۆڵ- نهۆمی دووەم
بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە
۳۱۹۳۹٤٦ ۰۷۷۰۲۱۷۸٦۸۲
E-mail: bryarmagazin@gmail.com
هەولێر ۰۷٥۰٤٤٦۳۲۲۳۰

چاپخانەی سەردەم

نرخ 2500 دینار

تەماشای
ئاسمانیش بکە
بۆ ئەوەی
پەروەردگار
پێیەکانت
دامەزراو بکات!!
*کاتێك
دەگەیتە لوتکە،
تەماشای دامێنی
بکە
بۆ ئەوەی بزانیت
کێ هاریکاری
کردیت بۆ
سەرکەوتن
بەرەو لووتکە
rsn
group
ئەم لاپەڕەیە بە سپۆنسەری
گروپی کۆمپانیاکانی ڕەسەن بڵاو دەکرێتەوە.

یەکەم دڵۆپ

# لێپرسراوێتی کۆمەڵایەتی کۆمپانیا تایبەتەکان

سەرنووسەر

ئەمرۆ هەڵسەنگاندنی ڕۆڵی کۆمپانیا تایبەتەکان لە جیهاندا تەنها لەسەر بنەمای قازانجو گەشەپێدانی ئابوورییان نییەو ناتوانن تەنها بەم کارە ناوبانگی باش بۆ خۆیان دروست بکەنو پێگەیەکی کۆمەڵایەتی دابمەزرێنن.

بەڵکو ئەوەی کە بووەتە پێوەری کۆمەڵگا بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو کۆمپانیایانە چەمکێکی نوێیە کە بریتییە لە (لێپرسراوێتی کۆمەڵایەتی)، (المسؤولیة الإجتماعیة).

لەو ڕێگایەوە کۆمپانیاکان دەتوانن سوود بە خاكو وڵاتی خۆیان بگەیەننو لە دڵی هاوڵاتیانیشدا جێگای خۆیان بکەنەوەو لەگەڵ کۆمەڵگاشدا کەنارگیر نەبنو پەیوەندییەکی پتەو دروست بکەن.

هاوکات تەنها ئامانجیشیان کەڵەکەکردنی سامان نابێتو ئامانجو پێداویستییەکانی کۆمەڵگاش وەبەرچاودەگرن.

لە گرنگترین ئەو بنەمایانەش کە پێویستە ڕەچاو بکرێت بۆ گەشەپێدانی بەردەوام هەروەکو (کۆڕی کاری جیهانی بۆ گەشەپێدانی بەردەوام) ئاماژەی پێ کردووە بریتییە لە: پەرەپێدانی ئابووری، پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، پاراستنی ژینگە.

شارەزایانیش لێپرسراوێتی کۆمەڵایەتی بە کارێکی گرنگ دەزانن، بۆ وەبیرهێناوەی کۆمپانیاکان سەبارەت بە ئەرکەکانیان بەرامبەر بەو وڵاتەی کە تیایدا دەژینو چالاکییە مادییەکانی خۆیانی تێدا ئەنجام دەدەنو سوود لە خاكو ئاووهەوای وەردەگرن، ئەو مرۆڤانەی کە هاونیشتمانو هاوزێدیانن.

لەبەرئەوەی زۆرجار ئامانجی کۆمپانیاکان تەنها قازانجو کۆکردنەوەی پارەیە، بێ ڕەچاوکردنی ڕێسا مرۆییەکانو ڕەوشتو ئاکاری کارو مامەڵەی بازرگانیو پاراستنی مافی کارمەندو فەرمانبەرانو ڕەچاوکردنی پاراستنی ژینگەو تەندروستی هاوڵاتیان زۆرێك لە حکومەتەکان، ئەم ئەرکەیان لە شێوەی یاسادا داڕشتووەو سەرمایەدارەکانیان پێوە پەیوەست کردووە.

چونکە بە داخەوە زۆرجار کۆمپانیا تایبەتەکان لەگەڵ کرێکارو کارمەندانی خۆشیاندا، دادگەرانە مامەڵە ناکەنو بۆ سوودو قازانجی خۆیان کاتژمێرەکانی کات زیاد دەکەنو کارمەندانیان ماندوو دەکەن، جاری وا هەیە چەندین کاریان پێ دەسپێرنو لە کۆتاییشدا مووچەی یەك کارمەندیان دەدەنێ.

ئەمە وێڕای ئەوەی لە وڵاتی ئێمە کارمەندانی کۆمپانیا تایبەتەکان ئایندەیەکی ڕوونیان نییەو چەند ساڵ کاربکەن هەر کاتێك وازبهێنن، یا دەربکرێن هیچ مافێکیان نییە.

سەبارەت بە لێپرسراوێتی کۆمەڵایەتیش ئەگەر سەرنجێکی خێرا بدەینە بارودۆخی کۆمپانیاکانی کوردستان ئەوا بەرامبەر بە ئیستغلالکردنی ئەو کۆمپانیایانە بۆ خاكو ئاوو سامانی مرۆیی ئەم وڵاتە، خزمەتێکی ئەوتۆ نابینیت کە شایانی باس بێت، وێڕای ئەوەی کە سوپاس بۆ خودا کەسانێکمان هەن کە وەکو ئەرکێکی مرۆییو هەستێکی کوردانە هەمیشە خزمەتی وڵاتو نەتەوەی خۆیان کردووە.

بەڵام هێشتا ئەوان ژمارەیان کەمەو لە چاو ئەو هەموو کۆمپانیایانەی کە بە هیچ شێوەیەك پێداویستی کۆمەڵگەو پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیو ژینگەپارێزی لە بەرچاوناگرن.

جێگای خۆیەتی تاکی کورد بپرسێت، سوودی ئەم کۆمپانیایانە کە هەموو ئاسانکارییەکیان بۆ دەکرێت چییە بۆ کۆمەڵگەی کوردەواری جگە لە هەڵاوسانیان لە پارەوە ساماندا نەبێت؟

مرۆڤی کورد چ سوودێك لە خانووبەرەی بەرزو ئۆتۆمبێلی گرانبەهای ئەوان وەردەگرێت؟!

پێویستە تاکی کورد ئەوەش بزانێت کە (لێپرسراوێتی کۆمەڵایەتی) خێرو سەدەقە نییەو ئەرکێکە دەبێت فەرز بکرێت بەسەر کۆمپانیاکاندا.

هاوکات دەبێت ئەوەش بزانن کە کردنەوەی کەناڵی ئاسمانی دوور لە هەموو بەها مرۆییو ڕەوشتییەکان، یاخود یارمەتیدانی بەرنامەکانی قومارو پێشبڕکێ بێسوودەکان، ناچێتە خانەی لێپرسراوێتی کۆمەڵایەتییەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەچێتە خانەی چەواشە کردنو سڕکردنو دوورخستنەوەی کۆمەڵگا لە ئامانجە بەرزەکانی.

لەبەرئەوە پێویستە دڵسۆزانی وڵات پرۆژە یاسایەك پێشکەش بکەن بۆ چەسپاندنی لێپرسراوێتی کۆمەڵایەتی کۆمپانیا تایبەتەکان، تا کۆمەڵگا سوودمەند بێتو ڕەوتی گەشەپێدانیش بە ئاقاری ڕاستەقینەی خۆیدا بڕوات.

# کارگێڕی بە گوفتار

خۆشبەختترین کەس، ئەو کەسەیە کە دەتوانێت خۆشبەختی بکەیەنێت بە زۆرترین ژمارە لە خەڵکی!

لاروشفوکور

لۆمــەی دوژمنایەتی گورگ ناکرێت، ئەگەر هاتوو شــوان خــۆی دوژمنی مەڕەکان بێت!

عومەر ئەبو ڕیشە

خۆشبەختی ئێمە لەو شتانەدا نییە کە هەمانە، بەڵکو لەو شتانەدایە کە پێویستمان پێیان نییە!

مۆریس بلوندیل

مرۆڤی بەهێز کار دەکاتو مرۆڤی لاوازیش خۆزگە دەخوازێت!

بەرنارد شۆ

ئەوەی ڕاست نەناسێت، ناتوانێت هەڵەش بناسێت!

الجاحظ

هەموو شتێکی بریقەدار ئاڵتوون نییە!

ولیام شکسپیر

# كارگێڕی بە چیرۆك

## ڕووناكی دڵەكان بەختەوەری بە جیهان دەبەخشێت!

ڕۆژێـك لـە ڕۆژان پرسـیاریان لـە حەكیمێـك كـردو پێیان گـوت: جیاوازی چییە لە نێوان بەختەوەریو داماوی دا؟

كابـرای حەكیم لـە وەڵامـدا گوتی: ئێسـتا پیشـانتان دەدەم كە خەڵكی چۆن هەست بە داماویو خەمباری دەكەن!

پاشـان فەرمـووی لێكردن بـۆ ژوورێك كۆمەڵێـك كەسـی تێـدا بـوو، لـە دەوری مەنجەڵێكی گەورەی خواردن دانیشتبوونو لە برسا سكیان دەگوشـی، بەڵام بێهیوان لەوەی دەسـتیان بگاتە خواردنەكە، لە كاتێكدا هەر یەكەیان كەوچكێكی گەورەی بە دەسـتەوەیە كە دەگاتە مەنجەڵەكە، وەلێ كلكی كەوچكەكان لە قۆڵـی هەریەكەیان درێژترە بۆیە ناتوانن كەوچكـەكان بەرن بۆ دەمیان، لەبەرئەوە لە نارەحەتییەكی گەورەدا دەژیان!!

پاشـان پێی گوتن: ئێستاش پیشانتان دەدەم كـە خەڵكـی چـۆن هەسـت بـە بەختـەوەری دەكـەن، دواتـر بردنـی بۆ ژوورێك هەروەكـو ژووری یەكەم، هەمان مەنجەڵی گەورەو كۆمەڵێك كەسـی تر بە هەمان كۆمەڵە كەوچكی درێژەوە!

بـەڵام خەڵكەكـەی ئـەوێ دڵخۆشو شادمان بوون؟!

لـە بینینـی ئـەم دیمەنە سـەریان سـوڕماو لە حەكیمیان پرسـی: ئێمە لەم كارە حاڵـی نابین، چـۆن دەكرێت ئەمانە لەوپەڕی خۆشـحاڵیدا بن، لـە كاتێكدا لە هەمان بارودۆخی ژووری یەكەمدا دەژین، لە هەمان كاتدا ئەوان لەوپەڕی خەمباریو داماویو بێهیوایی دا دەژیان؟!

حەكیم لە وەڵامدا گوتی: بەختەوەری بوو بە میوانی ژووری دووەم، كاتێك فێری ئەوەبوون ئاراسـتەی كەوچكـەكان بكەنە دەمـی یەكتری، لـەو كاتـەی نەیانتوانی بیبەن بۆ دەمی خۆیان.

*لەم چیرۆكەوە فێردەبین كە:*

١- بەختـەوەری بەرهەمـی كارەكانی خۆمانەو شـێوازی بیركردنەوەمان ڕێگای بەختەوەریمان دیاری دەكات.

٢- بەختـەوەری ئێمـە تەنهـا لـە بەرژەوەندییە تایبەتییەكانی خۆماندا نییەو زۆرجار پەیوەستە بە ژیانی كەسانی ترەوە.

٣- هۆكارەكانـی بەختـەوەری زۆرن، با تەنها هۆكارێك بە مایەی بەختەوەری خۆمان نەزانینو هۆكارەكانی تر تاقی بكەینەوە.

٤- دەتوانیـن بـە بەختەوەركردنـی كەسـانی دەوروبەرمـان سـنووری بەختەوەریمان فراوان بكەین، بە شێوەیەك هەندێجار دەتوانین سنوری بەختەوەریمان كیشوەرەكانیش ببڕێت.

٥- ئەگـەر هەمووومان وەكـو كۆمەڵی دووەم بیربكەینـەوەو كەوچكەكانمـان ئاراسـتەی دەمی یەكتر بكەین هاوكاریو برایەتیو خۆشەویسـتی باڵ دەكێشێت بە سەرمانداو ژیان پڕ دەبێت لە بەختیاری.

زۆر سانایە ئەو نەریتە بە جێبهێڵیت کە بەسەرتدا زاڵە، کاتێك دەوروبەرەکەت هەموویان نقومی کارکردنن، لە یادت بێت هاوکارەکانت حەزدەکەن کاتێکی خۆش بەسەر بەرن، هەروەك تۆش حەزدەکەیت، پاڵپشت بە توێژینەوەیەك کە ڕۆژنامەی (ذاستریس تایمز) بڵاوی کردووەتەوە، دەریخستووە دە نەریت هەیە بێزارکەرن، ئەگەر هاتوو لە فەرمانبەردا هەبوو، ئەوانیش بریتین لە:

١- ئەنجامدانی پەیوەندی تەلەفۆنی دوورو درێژو بێ پاساو، کە لەوانەیە کاتژمێرێك بخایەنێت لە کاتێکدا کاتی دەوامی فەرمییەو دەبێت بە ڕاپەراندنی کار بە ڕێبکرێت.

٢- دەرچوون بەر لە تەواوبوونی وادەی دەوامی فەرمیو جێهێشتنی کارەکان بۆ ڕۆژی دواتر، یان بۆ هاوکارێکی تری، بە کورتی هەڵاتن لە بەرپرسیارییەتی سەرشانی!

٣- کڕینی دیاری گونجاو بۆ هاوکارێکت بە بێ پرسو ڕای هاوکارەکانی تر، دوایی داواکردنی دانی نرخەکەی بە بێ وەرگرتنی ڕەزامەندییان.

٤- خواستنی ئامێرو کەلوپەلەکانی نووسینگە، بە بێ ئەوەی بیر لە گەڕاندنەوەی بکەیتەوە، لە هەمان کاتیشدا هاوکارەکانت وادەزانن کە ونیان کردووە.

٥- کەمتەرخەمی لە پاکو خاوێنی کوپی خواردنەوەو کەلو پەلەکانی تری نووسینگە.

٦- جێهێشتنی ئەو پەڕانەی لەسەر ئامێری پرێنتەرەکە، یان کۆپی کردنەکە گیر بوون، بە بێ ئەوەی خەمی دەرهێنانی بخۆیت، دووبارە ئامێرەکە بخەیتەوە کار، یان داوای هاوکاری کەسانی تر بکەیت.

٧- وەڵامدانەوەی پرسیارو ڕادەربڕین لە سەر ڕووداوێك بەوەی کە بڵێیت (وایان وت!).

٨- گوێگرتن لە مۆسیقا، یان گۆرانی بە دەنگی بەرز، بەبێ ڕەچاوکردنی دەوروبەرت، لە وانەیە هاوکارانت تووشی بێزاری ببن لەو دەنگە بەرزە، یان لەوانەیە لەم کاتەدا حەز بە بیستنی هیچ نەکەن.

٩- قسەکردن بە دەنگی بەرز بە مۆبایل.

١٠- ساردوسڕی لە مامەڵەکردنو گەرم

# ئەو نەریتانەی دەبنە مایـــەی بێـــزاری لــــە فەرمانبـــەردا!

م. هاژە شێروانی

گوڕ نەبوون لەگەڵ هاوکارانی ژوورەکەت.

لە کۆتایی توێژینەوەکەشیاندا زانایانی دەروونزانی پیشەیی کۆمەڵێك ئامۆژگارییان خستووەتە ڕوو کە یارمەتیدەرە لەسەر ڕاگرتنی هێمنی کەسێتی، وەك وەرگرتنی پشوویەکی کورت، دوورکەوتنەوە لە نووسینگەی کار ماوە ماوەو بۆ کاتی کورت، پیاسەکردن لە نێو ڕاڕەو ناوخۆییەکانو وەرگرتنی هەناسەی قووڵ، خواردنی ژەمە خۆراکی سووك، لە کۆتایشدا دوورکەوتنەوە لەو کەسو شتانەی تووشی دوودڵیو نائارامیت دەکەن.

تا ئێرە ڕای ئەو توێژینەوەیە بوو کە لەڕۆژنامەی (ذاستریس تایمز)دا هاتبوو، ئەوەی لێرەوە مەبەستمانە ئەوەیە کە هێشتا زۆر نەریتی تری بێزارکەر هەن، توێژینەوەکە باسی نەکردوون، ڕەنگە لەبەر جیاوازی ژینگەو ئەو دامەزراوانە بێت کە توێژینەوەکەی لێکراوە، لێرەوە دەتوانین نەریتەکانی تر بخەینە ڕوو کە لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی زۆرێك فەرمانبەران لە دامو دەزگاو دامەزراوە ئەهلیو حکومییەکان بەرچاودەکەون، ئەوانیش بریتین لە:

١- خۆهەڵقورتاندن لە کاروباری تایبەتی، بە تایبەتیش لە نێو زۆرێك لە هاوکارەکانی یەك نووسینگە، لەوانەیە زۆرجار هاوکارێکمان بارودۆخێك، یان کێشەیەکی هەبێتو حەزنەکات کەس پێی بزانێت، ئەگەر هاتوو خۆت هەڵقورتاند لە کاروباری بە پرسیارکردنی نابەجێ، لەوانەیە هەراسانی بکەیت؟ دڵنیابە ئەگەر حەز بکات خۆی دێتو هەموو شتێکت بۆ باس دەکات.

٢- زۆری هاتووچۆکردن لە نێو یەکەو هۆبەو بەشەکانی تری دامەزراو بەبێ پاساوو تەنها بۆ کات بەسەربردن، بەمەش ڕێچکەی کارەکان دەوەستێتو مامەڵەکان لە سەر نووسینگەکەت کەڵەکە دەبنو کاری ئەمڕۆت تەواو نەکردووە، هی سبەینێشی دێتە سەر، ئەمەو سەرەڕای زۆری هاتووچۆکردنی سەردانکەران بۆ تەواوکردنی مامەڵەکانیان کە زۆرجار دەنگە دەنگو پەنابردنە بەر سکاڵا کردنو واسیتەکردنی لێدەکەوێتەوە.

٣- ڕەچاونەکردنی مۆڵەت وەرگرتن، کە تەنها دەبێت بۆ کاتی پێویست بێت، نەوەك بۆ خۆدزینەوە لە کارو دوایی کە سەیری ڕەسیدی مۆڵەتت دەکەیت دەبینیت هیچت نەماوەو لەم ساتەشدا تۆ زۆر پێویستت بەم مۆڵەتە هەیە.

٤- قسە هێنانو بردن لە نێوان یەکەو هۆبەکانی دامەزراو، هەڵسان بە گاڵتەو گەپی بێ بنەما کە لەوانەیە زۆرجار کێشەی گەورەی لێبکەوێتەوە.

٥- تەرخانکردنی ئامێرو کەلو پەلەکانی نووسینگەکەت بۆ کاری تایبەتیو بە تایبەتی دانانی یاری قەبارە قورس لە سەر کۆمپیوتەر، لە دەرەنجامیدا لەوانەیە ببێتە هۆکاری تێکچوونو لە ناوبردنی زانیارییەکانی ناو کۆمپیوتەرەکەت، ئەگەر هاتوو ئەم کۆمپیوتەرە لەماڵەکەتدا بووایە دڵنیام دڵت نەدەهات بەم شێوەیە بە کاری بهێنیت.

٦- ئیرەیی بردنو ڕکابەرایەتیو سەرهەڵدانی ململانێی بێ بنەما لە نێوان هاوکارەکان بە هۆی خۆبردنە پێش لە بەرپرسی یەکەم، یان بەڕێوەبەری ڕاستەوخۆ بۆ مەیسەرکردنی کارەکانو قۆزتنەوەی بارودۆخەکە بۆ بەرژەوەندی کەسی.

٧- فەرامۆش کردنی مامەڵەی هاوڵاتیانو سەردانکەرانی دامەزراوەکەت، بە بیانووی بێ بنەماو کەڵەکەبوونی پەڕەو نوسراوە فەرمییەکانو لە وانەیە زۆرجار ونبوونی زۆرێك لە نوسراوە گرنگەکانی لێ بکەوێتەوە.

٨- هاوکاری نەکردنو نەبوونی ڕۆحی هاوکاری لە نێوان فەرمانبەرانی یەك یەکە، یا هۆبە، سەرقاڵ بوون بە تەنهاو تەنها بە یەك کارو لادانی بەرپرسیارییەتی کارەکانی تری نێو یەکەکە لە سەرشانی خۆت، بە واتای دابەشکردنی کارە لاوەکییەکانو فەرامۆشکردنی کارە سەرەکییەکان!

ئەمەو چەندان خاڵی لاوازی ترو نەریتی نێگەتیف کە لێرەدا ئاماژەیان پێ نەکراوە، کەواتە خوێنەری بەڕێز لەگەڵماندا بن بۆ ژمارەی داهاتوو بۆ خستنەڕووی چارەسەری گونجاو بۆ وازهێنان لەم نەریتانەی سیمای جوانمان ناشیرین دەکەن!

# لێهاتووییەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکدا

ن: محمد طارق السويدان
و: دلشاد محەممەد

## بەشی یەکەم

بەشێکی گرنگی کاری کارگێڕیی، یان سەرکردە پەیوەستە بە هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ کەسانی دەوروبەر، مامەڵەکردن لەگەڵ هاوتاو هاوکارو سەرکردەو شوێنکەوتووانو کەسانی تر، بەڵام زۆر کەس وەك پێویست گرنگی بەم لایەنە نادەن...

سەرکردایەتی بریتییە لە «هونەری بەڕێوەبردنی خەڵكو ئاڕاستەکردنیان بەرەو ئامانج» بەڕێوەبردنی خەڵکیش پەیوەستە بە هەڵسوکەوتکردن لەگەڵیاندا، بەجۆرێك قەناعەتیان پێ بکەیت تا هاوکارت بن بۆ هێنانەدی ئامانجێك بە دواتدا هەنگاوبنێنو شوێنت بکەون..

(بیلفەر شتاین) دەڵێت: «زۆرێك لە پیاوانی کارگێڕیی پێیانوایە پەیوەندییە مرۆییەکان بەشێکە لە کتێبی ڕێکخستنی کار، بەڵام ئەوان لەوەدا بە هەڵەداچوون، بەڵکو پەیوەندییە مرۆییەکان هەموو کتێبەکەیە».

هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا پێویستی بە چەندین لێهاتوویی جۆراوجۆر هەیە کە مرۆڤ ناتوانێت بەبێ ئەو لێهاتووییانە برەو بە خۆی بداتو خەڵکی لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە.. توێژینەوە زانستییە نوێیەکان دەریانخستووە کە سەرکەوتنی مرۆڤ لە سەرکردایەتی کردندا پەیوەستە بە توانستو لێزانیو سوارچاکیی لە لێهاتووییەکانی مامەڵەکردندا، لە سەدا (٨٥٪)ی سەرکەوتن لە بواری سەرکردایەتییدا دەگەڕێتەوە بۆ لێهاتووییەکانی مامەڵەکردن، ئەگەرچی ئەو لێهاتووییانەش پێویست ناکات هەمووی پێکەوە بەکاربهێنرێت، بەڵکو بە پێی شوێنو هەڵوێستو کەسی بەرامبەر بەکار دەخرێت..

لێهاتووییەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا، بریتیین لە: تێگەیشتنو پەیوەندی لەگەڵ بەستن، کارتێکردن، هاندان، بوونیادنانی پەیوەندییەکان.. بە پشتیوانی خودا هەر یەك لەم لێهاتووییانیە لە چەند ژمارەیەکدا دەخەینەڕوو... لەم ژمارەیەشدا قسە لەسەر لێهاتوویی یەکەم دەکەین کە بریتییە لە:

١- تێگەیشتنو پەیوەندی لەگەڵ بەستن:

بە مەبەستی بەدیهێنانی لێهاتوویی (تێگەیشتنو پەیوەندی بەستن) پێویستە لە سەرمان:

یەکەم: گوێ لەو شتانە بگرین کە خەڵکی دەیڵێت: مەبەستیش لێرەدا ئەو بیستنو گوێشلکردنە ڕاستەقینەیە کە تێفکرینو تێڕامان لە وتەکانی قسەکەری لەگەڵدایە، لە ڕاستیدا گوێنەگرتن باجی زۆر بە مرۆڤ دەداتو ڕەنگە بشبێتە هۆی تیاچوونی، یەکێك لە هۆکارەکانی تێکشانی مەکۆی ئاسمانی (چالنجەر) بریتی بوو لە نەتوانینی بیستنو گوێگرتن.

دووەم: پێویستە لە هەستو نەستەکانی خەڵكو هەموو ئەو شتانە بگەیت کە لە دڵو دەروونیاندا خول دەخۆن: سەرکردە هەمیشە پێویستی بە دیاریکردنی مەوداو نێوانی دەروونی جیاکەرەوە لە نێوان خۆیو خەڵکیدا هەیە، ئەویش بەدیاریکردنی ئەو گرفتوکێشانەی کەسی بەرامبەر پێوەی دەناڵێتو هەوڵدانی جددیو چالاکانە بۆ دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆی.

سێیەم: هەروەها پێویستە سەرکردە لە باری دەروونی مرۆڤەکان تێبگات: سەرکردەی کاراو کاریگەر ئەو کەسەیە کە توانای پێشبینیکردنی ئەو شتانەی هەیە کە لە دەروونی مرۆڤەکاندا خول دەخۆنو دێنو دەچن، پاشانیش مامەڵەو هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ هەر کەسێکدا بەوشێوەیەی کە شیاوو گونجاوە بۆی، ئەوەتا پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێت) کاتێك گوێی لە دەنگی گریانی منداڵ دەبێت نوێژەکەی کورتدەکاتەوە لەبەر ڕێزگرتن لە هەستو نەستی دایکەکەو تەواوی نوێژخوێنان..

بە پشتیوانی خودا، لە ژمارەی داهاتوودا باس لە لێهاتوویی دووەم لە لێهاتووییەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکی دەکەین کە ئەویش (لێهاتوویی کارتێکردن)ە.

# دبلۆماسییەت

شوان رابەر

* پێناسەی دبلۆماسییەت: لە ڕووی زمانەوانییەوە دبلۆماسییەت وشەیەکی یۆنانییە، لە وشەی (دیپلۆما) وەرگیراوە، واتە (الوثیقە) دیکۆمێنتو بەڵگەنامە.

* «دبلۆماسییەت چییە؟ دبلۆماسییەت زانستە، هونەرە، یاسایە، مێژووە، دامەزراوەیە ، پیشەیە».

* دبلۆماسییەت زانستە: چونکە چەند یاساو ڕێساو بنەمایەك دەگرێتەخۆ کە تەحەکوم بە چۆنییەتی پراکتیزەکردنی دەکات لە پەیوەندی نێوان تاکو لایەنو وڵاتاندا.

* دبلۆماسییەت هونەرە: چونکە پراکتیزەکردنی ئەم پرۆسەیە پەیوەندییەکی بەهێزی بە تواناو هونەرو شارەزاییو ئەزموونی ئەو کەسەوە هەیە، لە بروا پێهێنانی تاکو لایەنو وڵاتاندا.

* دبلۆماسییەت یاسایە: چونکە یاساو ڕێساو بنەماکانی کارپێکردنی ئەم پرۆسەیە لە نێوان هەموو کەسو دامودەزگا نێونەتەوەییە لە یەکتر جیاوازەکان بۆتە یەك سیستەمو شێواز.

* دبلۆماسییەت مێژووە: لەبەرئەوەی پرۆسەیەکی زۆرکۆنو مێژووییە، هەر لە دێرزەمانەوە بە جۆرەها شێوازی جیا جیا لە نێوان تاکو کۆمەڵانو وڵاتاندا ئەنجامدراوە، پاشان بەرە بەرە پەرەی سەندووەو بە هێزبووە.

* دبلۆماسییەت دامەزراوەیە: لەبەرئەوەی ئەم پرۆسەیە لە هەموو وڵاتو پارتێکدا لە چوارچێوەو لە میانەی چەند دامودەزگاو کۆمیتەو کۆمیسیۆنێکی پسپۆڕو سەربەخۆدا پراکتیكو مومارەسە دەکرێت.

* دبلۆماسییەت پیشەیە: لەبەرئەوەی ئەو کەسانەی کە ئەم کارو ئەرکە پراکتیكو مومارەسە دەکەن، خۆیان بۆ ئەوە یەکلا دەکەنەوەو هەموو هەوڵو ماندووبوونێکی تێدا دەدەن، ئەوپەڕی کارو چالاکی تیادا ئەنجام دەدەن، وەکو هەر کارێکی ترو سەربەخۆ.

* دبلۆماس کێیە؟ ئەو کەسانەن کە کارو ئەرکی پەیوەندییەکانی وڵاتی خۆیان لە دەرەوەی وڵاتان دەگرنە دەست، بۆ گرێدانی پەیوەندی لە نێوان خۆیانو خەڵکی تر. لە عەرەبیدا ئەم زاراوانەی بۆ بەکاردێت:

١- الممثل الدبلوماسی ٢- الجهاز المرکزی للشؤن الخارجیة ٣- الخدمة الخارجیة ٤- هیئات العلاقات الدولیة ٥- المعتمدین ٦- الوکلاء ٧- السلك السیاسي ٨- الممثل السیاسي.

- سیفەتە کانی دیبلۆماسی:

یەکەم: ڕواڵەتی دەرەوەی دبلۆمات:

١- ناو جوانیو شۆرەت جوانی.

٢- ڕەنگو ڕووخسارجوانی: وەك: (جوانی لاشەو ڕووخسار + دروستی جەستە، پەککەوتە نەبێت، کەمئەندام نەبێت).

٣- ڕواڵەت جوانی: وەك (پاکی لاشەو جلوبەرگ، جوانیو گونجانی جلوبەرگ)، بۆئەوەی سەرنجڕاکێش بێت.

دووەم/ناوەڕۆکی کەسایەتی دبلۆماسی:

١- ڕەوانبێژو زمانپاراوو زمانی دبلۆماس: وەك (خێراقسەکردن، جوان قسەکردن، کورتو پوختی، ڕوونیو ئاشکرایی لە قسەدا، قسە لەسەر خۆکردن، نەشێوان، بە هەڵە نەچوون، دووبارە کردنەوەی قسە گرنگەکان، قسە نەپچڕاندن).

٢-زمانو زاراوەی دبلۆماسییەت. ئەو زمانەیە لە کاتی (کۆڕو کۆبوونەوەو دیالۆكو ناردنو نووسینو مێزگردو چاوپێکەوتنەکاندا) قسەی پێ دەکات. کە دەبێ زمانێکی: (گشتی، ڕێزمانی، بەڕێز، هاوسەنگ، تەڕوپاراو) بێت.

سێیەم/ کردارو ڕەفتاری دبلۆماس:

١- ڕێزگرتنی بەرامبەر.

٢- نەرمیو لە سەرخۆیی .

٣- یەکترناسی (ناسینی خۆتو ئەوانی دیکە).

٤-پاراستنی ئادابی گفتوگۆ.

٥-پاراستنی ئادابی (کۆنگرەکان، چاوپێکەوتنەکان).

* جۆرەکانی دبلۆماس:

١- سەرۆکی دەوڵەت ٢- ئەندامی حکومەت وەك: (سەرۆك وەزیران، وەزیری دەرەوە، وەزیرانی تر، پلەو پایەکانی سەرەوە لە دەوڵەتدا).

٣- نێردراوەکانی دبلۆماسی: ئەمانەن:

١- سەرۆکی نوێنەری دبلۆماسی وەك: (باڵوێز، ئەمپیادور، وەزیرێکی ڕاسپێردراو).

٢- کارمەندە دبلۆماسەکان وەك: (ڕاوێژکار، سکرتێر، پاشکۆی دبلۆماسی).

٣- تاکەکانی خانەوادەی نوێنەرە دبلۆماسەکان.

٤- کارمەندە کارگێڕیو تەکنیکییەکان.

٥- خزمەتکاری تایبەت.

٦- قنسولگەرەکان.

٧- تاکەکانی نوێنەری دبلۆماسی تایبەت.

٨- نوێنەرو فەرمانبەرەکانی دەوڵەت لە ڕێکخراوە نێو نەتەوەییەکاندا

# ڕۆشنبیریی ڕێکخستن

ناسیح مەجید

(هەوڵمەدەن هاودەمی کەسانی سەرکەوتوو بن، بەڵکو هەوڵ بدەن هاودەمی کەسانی بە ڕەوشت بن). (ئەلیبێرت ئەنیشتاین).

ڕۆشنبیری ڕێکخستن وەك چۆن (کۆبیرج و چمیر) پێناسەی دەکەن، دادەنرێت بە (ڕژێمێکی هاوبەش لە نێوان ڕەوشتو بیروباوەڕدا، دەبێتە هۆی بنچینەی ڕەوشتو ئاڕاستەکردنی هەڵسوکەوت، لەبەرامبەردا دۆزینەوەی ڕێگایەکی گونجاو بۆ کاری ڕێکخستن.

هەروەها (مەمدوح جەلال) دەڵێت: «ڕۆشنبیری ڕێکخراوەیی دادەنرێت بە لایەنێکی وەرگیراوو پێشخراو لە زۆربەی ڕێکخستنەکانداو لە لای زۆربەی بەڕێوەبەرەکان. ئەمەش هەر یەکە لە (بیترزو وترمان) لە کتێبەکانیاندا داکۆکیان لەسەر کردووە. کە زۆرترین فرۆشیان هەبووە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، بە ناوی (گەڕان بەدوای جیاکارییەکاندا) باس لەو کۆمپانیایانە دەکات کە زیاترین سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە لە ئەمەریکاداو ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن بەبێ جیاوازی باڵادەستیو سەرۆکایەتی یەکگرتوو، پێکەوە بەسترانو توندوتۆڵی لەو کۆمپانیایانەدا ئەوەی سەلماندووە کە بنچینەی بنەڕەتین بۆ سەرکەوتن.

ڕۆشنبیری ڕێکخراوەیی بۆچی؟

دەتوانین گرنگی ڕۆشنبیری ڕێکخراوەیی لەم خاڵانەی خوارەوەدا بخەینە ڕوو:

یەکەم/ بەڵگەیە بۆ بەڕێوەبردنو کارکەران:

پێویستە نموونەیەکی سلوکیو پەیوەندی پێشکەش بکرێت، تا شوێنی بکەونو ڕێنوێنیان بکات، (مورسیو هەندێکی تر) ئاماژە دەکەن بەوەی کە گرنگی ڕۆشنبیری ڕێکخراوەیی هاوکار دەبێت لە بینینی ڕۆڵی ڕۆشنبیری خۆیو لە ئاڕاستەکردنی ئەندامەکانو چالاکییە ڕێکخراوەییەکان، بە مەبەستی ئاڕاستەکردنی فیکریو هەوڵەکان بۆ بەجێگەیاندنی ئامانجەکانی ڕێکخراو پەیامەکانی. هەروەها ڕۆشنبیری هەڵدەستێ بە دیاریکردنی شێوازو خێرایی وەڵامدانەوەی ئەندامەکان بۆ ڕێکخراو جوڵاندنی گیانی پێشبڕکێ کاریو پێویستییەکانی ئەندامەکان، بە شێوەیەك دەستەبەری بۆ ڕێکخراو دەکات لە ڕووی ئامادەباشیو گەشەکردنی تواناکانیان. هەروەها تەواوکاری ناوخۆی ئەندامەکان دەکات لە ڕێگای شارەزاییکردنیان بۆ پەیوەندیکردن بە یەکەوەو شێوازی کاری هاوبەش، هەروەها هەڵدەسن بە جێبەجێکردنی خۆگونجاندن لە نێوان ڕێکخراوو ژینگە دەرەکییەکەیدا بەدەرخستنی پێداویستییەکانو داواکارییەکانی لایەنەکانی ژینگەی دەرەکی کە پەیوەندیدارن بە ڕێکخراوەکەوە. لەبەر ڕووناکی ئەوەی سەرەوەدا، دەتوانین بڵێین: گرنگی ڕۆشنبیری ڕێکخراوەیی ئەوە فەراهەم دەهێنێت کە ئەندامان هەست بە سۆزی خۆیان بکەن بۆ ڕێکخراوو هاوکاری لەسەر بەدیهێنانی پابەندی لە نێوان خۆیانداو وەك ڕابەریکردنی سلوکی گونجاو بە شێوەیەك کە خۆشەویستی ڕێکخراوەیی دروست بێت. هاوسەنگیو خۆگری وەك ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی کار دەکات، لەسەر پێکهێنانو پێشڕەوی کردنی سلوکی ئەندامەکانو کۆمەڵەکە.

دووەم/ بواری فیکری: ئاڕاستەکردنی ڕۆشنبیری ئەندامانی ڕێکخراوو ڕێکخستنی کارەکانیانو پەیوەندییەکانیانو ئەو دەستکەوتانەی بەدەستیان هێناون، کاریگەری زۆری دەبێت لەسەر چۆنییەتی کارکردن. لەبەراوردکارییەکدا لە نێوان ١٨ کۆمپانیادا یەکێکیان توانی سەرکەوتنێکی درێژخایەن بۆ خۆی مسۆگەر بکات، ئەوە توانیوای لە (جێمس سی کۆلێنیو جیری ئەی بورانس) بکاتو بڵێن: «هۆکاری سەرەکی لە سەرکەوتنی ئەو کۆمپانیایەدا ئەوەیە کە ئەو خاوەنی ئەو ڕۆشنبیرییەیە کە هەموو کرێکارەکانی بەشدارن تێیدا، ئەویش بریتییە لە یەك ئاڕاستەی نەتەوەیی کە دەزانن لە دڵیاندا چی باشە ئەنجامی بدەن بۆ کۆمپانیاکەیان. لە کتێبەکەیاندا لە بارەی ڕەفتارە کۆمەڵایەتییە سەرکەوتووەکان بۆ ئەو کۆمپانیایە، دەریانخست ئەو کۆمپانیایە توانیویەتی خۆگونجان لەگەڵ جیهانی گۆڕاودا ئەنجام بدات، بێ ئەوەی دیدی خۆی بەرامبەر ئاڕاستە ڕێکخراوەییەکەی ون بکات. هەندێ لەو کۆمپانیایانە هەڵدەستن بە نووسینەوەی ڕەوشتە کۆمەڵایەتییە بە دەستهاتووەکانی خۆی بۆ نەوەکانی داهاتووی.

سێیەم: لە بواری ڕێکخستندا: ئەو ڕۆشنبیرییەی کە نیگا بەخشە بە ڕەوشتو بنچینە سلوکییەکان، دەبێتە هۆیەك بۆ دیاریکردنی سلوکی ناوەکی بۆ ئەندامەکان، هەروەها دەبێتە هۆیەك بۆ جۆراوجۆر کردنی پەیوەندی نێوان ئەندامەکان خۆیانو ئەو پەیوەندیانەی لەگەڵ کارکەرانو

لایەنەکانی تردا کە پەیوەندیان هەیە پێیانەوەو کاری لەگەڵدا دەکەن. تارادەی پۆشینی جلوبەرگو شێوەو ڕەفتاری کۆمەڵایەتیانو شێوەی قسەکردنیانو ئەو پرۆگرامەی کە چارەسەری کێشەکانی پێ دەکەنو لەسەری ڕادێنو شوێنی دەکەون. لەم بارەیەوە (جاد ئەلرەب) دەڵێت: «ڕۆشنبیری ڕێکخراوەیی گەشە بە لایەنە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو ڕێکخراوە دەدات لە بری لایەنی کۆمەڵایەتی تاکەکان. لەبەر گرنگی ڕۆشنبیری ڕێکخراوەییو کاریگەری لەسەر هەموو چالاکییەکانی ڕێکخراو (ئوت) لەو بڕوایەدایە کە ڕۆشنبیری ڕێکخراوەیی بریتییە «لە ڕێکخراو بە گشتی نەك تەنها بەشێك بێت لێی»، لەبەرئەوە پێویستە لەسەر ڕێکخراوەکان دروشمەکانی ڕۆشنبیرکردن بگرنە بەر لەو ڕۆشنبیرییەی کە لە دەوروبەریاندا هەیە. ئەوەش بە تەواوی لەبەر چاوبگرنو چونکە کاریگەری گەورەی هەیە لە پێکهێنانی سلوکی ئەندامەکانداو ئەوەی پێشبینی دەکەن ئەوەش بە شێوەی پۆزەتیف، یان نێگەتیف کار لە تەواوی چالاکییەکان دەکاتو لە چالاکییەکانی ڕێکخراو بە شێوەی گشتیو کردارەکانی ڕاهێنان بە شێوەیەکی تایبەتی. ئەوەش بە پێی بەهێزی ماددەکانی ڕۆشنبیری ڕێکخراوەییەکە لەسەر ڕێکخراوەکە.

چوارەم: لایەنە تایبەتەکانی ڕێکخراوەکە:

ئەمەش جێگای شانازییە بۆ کارمەندان بە تایبەت ئەگەر داکۆکی بکاتە سەر ئەو بەها زانیارییەی ببێتە هۆی داهێنانو چاککاریو سەرکەوتن. بەسەر پێشبڕکێکاراندا.

پێنجەم: ڕەگەزی کاریگەرو پشتگیری لە ئیدارە:

ئەمەش دادەنرێت بە یەکێك لە ڕەگەزە هاوکارەکان بۆ بەجێگەیاندنی ئامانجەکانو خواستەکانی ئیدارە. کە ڕۆشنبیری بەهێز بوو زۆربەی زۆری کارمەندان زیاتر پەسەندی دەکەنو ڕەزامەند دەبن لە ڕووی بەهاو دەستورەکانو بنچینەکانیو ڕەنگدانەوەی هەمەوەکی دەبێت لەسەر هەڵسوکوتو پەیوەندیەکانیان. لەبەر ئەوەش (مەمدوح جەلال) دەڵێت: «زۆربەی زۆری بەڕێوەبەران ڕۆشنبیری سەرەتایی دەدەنو گرنکی پێویست بە ڕۆشنبیری ڕێکخراوەیی دەدەن، لەبەرئەوە واسەیری ڕۆشنبیری دەکەن کە ڕەگەزێکی گرنگە، لە هەندێ توێژینەوەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەو ڕێکخراوانەی ڕۆشنبیری تەواو وەردەگرنو لەسەر بنچینەی ڕەزامەندیو پڕکردنەوەی پێداویستییە گۆڕاوەکان بۆ کارمەندانو ئەندامەکانیانو جێگای ئەوەشە کە ئەو ڕێکخراوانەی خاوەنی ئەو ڕۆشنبیرییە نین بتوانن ئەوە بۆ خۆیان فەراهەم بهێنن. ئەو کۆمەڵو ڕێکخراوەیە خاوەنی ڕۆشنبیری بەهێز بێت کاریگەریی زیاتر لەسەر دەوروبەرەکەی دروست دەکات. بە پێچەوانەی ئەو ڕێکخراوانەی کە خاوەنی ئەو ڕۆشنبیرییە نین. ڕێکخراوی سەرکەوتووش پێویستی بە ستراتیژییەتی کاریگەر هەیە لەگەڵ ئەوەشدا پێویستی بە ڕۆشنبیری هەیە کە ببێتە پاڵ پشت بۆ ئەو ستراتیژییە.

شەشەم: ئاسانکاری گرنگی ئیداریو سەرکردایەتیکردنی ئەندام: پەنا مەبەنە بەر لێپێچینەوەی فەرمی، یان توندوتیژ بەرامبەر بە کەسی داواکراو، ئەمەش (جادئەلرەب) داوای دەکاتو دەڵێت: «ڕۆشنبیری ڕێکخراوەیی ئاشکرا لە هەر ڕێکخراوێکداو لە هەر ناوچەیەکی دونیادا، وێنە نمایەکی ڕوون و قوڵ دەداتە ئەندامان بە شێوازێك دەبێتە هۆی بە دەستهێنانی شتەکان».

حەوتەم: جیاوازی پێشبڕکێ لە کاری ڕێکخراوەییدا: ئەگەر داکۆکی لەسەر هەڵسوکەوتو ڕەوشتی ئەندامان کرایەوەو خزمەتگوزاریان پێشکەشکراو دوورکەوتنەوە لەسەر ئەو کارەی کە بەڕۆتین دادەمەزرێت، وەك گوێڕایەڵی تەواوو پابەندی وشە بە وشە، هەروەها (جاد ئەلرەب) دەڵێت: «ئەگەر خزمەتکردن ببێتە هەموو شتێك کە ڕێکخراو پێشکەشی دەکات، ئەو کات ڕۆشنبیری خزمەتگوزاری دەبێتە پێوەری سەرەکی بۆ سەرخستنی ڕێکخراو».

هەشتەم: ئامادەکردنو گرتنەخۆی ئەندامانێکی گونجاو:

ڕێکخراوە پێشەنگەکان ئەندامانێکی چالاك پەلکێشی خۆیان دەکەن، ئەو ڕێکخراوانەی کە بنیاتی داهێنانو سەرکەوتن دەکەن کارمەندانێکی داهێنەر لەخۆیان دەگرن، کە هاندەری خۆڕاگریان هەیە.

نۆیەم: ڕەگەزی بنچینەیی هاوکارە بۆ توانایی ڕێکخراو بۆ گۆڕان:

هەرچەندە بەهای کاری ڕێکخراو گونجاو وەرگیراو بن، ئەو ڕێکخراوە لە توانایدا هەیە، بۆ گۆڕان سور دەبێت لەسەر سودگەیاندن، هەرچەند بەهاکان جێگیر بن ئەوا توانای بۆ گۆڕان کەم دەبێتەوەو ئامادە نابێت بۆ بەرەو پێشچوون. لەمبارەیەوە (جاد ئەلرەب) دەڵێت: هەندێ توێژینەوە ئەوە دەردەخەن کە ڕۆشنبیری ڕێکخراوەیی بەشێکی گرنگو بنچینەییە بۆ تەواوکاریو باشی لە کاردا «هەروەها کاروسبی، دەڵێت: «باشی بەشدار دەبێت لە ڕوون نیشاندانی پەیامەکانی ڕێکخراو کە دادەنرێن بە کلیلی سەرەکی تواناکانی ڕێکخراوەیی».

دەیەم: چاوەدێری لەسەر کاری ئەندامانو ڕێکخراو کلیلی پارێزەری گشتگیریە: بریتییە لە کارلێکردنی گشتی لەگەڵ کۆمەڵگای ناوخۆیو هەرێمی دا، ئەمەش ناو دەبرێت بە تەواوکاری ڕۆشنبیری. (کوبەیسی) زۆر گرنگی دەدات بەمەو دەڵێت: گرنگییەکی تری ڕۆشنبیری ڕێکخراوەییە لە ماوەی ڕۆڵی دانانی ئاماژە سورەکان کە ڕێگا نادات بە ڕێکخراو کە بە نێویدا گوزەر بکات. مەگەر کاتێك ئەمە ڕووبدات کە هەڵەیەك ئەنجام درابێت، یان تاوانێك کەوتبێتە ئەستۆی ڕێکخراو، مەگەر خۆی دەخاتە بەر بەرپرسیاریەتی لە بازنەی حەرام کراوەکاندا. هەروەها ڕۆشنبیری ڕێکخراو وەك هەر ڕەگەزێکی تر لە ژیانی ڕێکخراودا پێویستی بە هەوڵەکان هەیە بۆ بە پێزو بەهێز کردنیو پارێزگاری لە ئارامگری ڕێژەیو بنیاتنان بکات لە دڵو دەروونی ئەندامەکانی دا.

لە کۆتاییدا بەم وتەیەی جاسم دوسری دێمە کۆتایی باسەکە کە دەڵێت: بایەخدان بە ڕۆشنبیری ڕێکخراوەیی لە لای زۆرێك لە ڕێکخراو بەڕێوەبەرەکان زیادی کردووە، بە شێوەیەك کاریگەری لە سەر کارو چالاکی ئەندامانی ڕێکخراو کردووە، «ئەمەش (بیتەرز و واترمەن) داکۆکیان لەسەر کردووەو دەڵێن: «بەبێ جیاوازی بالادەستیو دەسەلاتیو یەکگرتوویی ڕۆشنبیری لەو ڕێکخراوانەدا دیارە کە زیاتر سەرکەوتنیان پێوە دیارە لە ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکادا، سەلماندویەتی کە بنچینەیە بۆ سەرکەوتن.

سەرچاوەکان:


١- الثقافه التنظيمية وعلاقتها بالانتماء التنظيمى، إعداد حمد بن فرحان الشاوى، إشراف أ.د. محمد فتحى محمود.

٢- الثقافه التنظيمية وعلاقتها بالالتزام التنظيمى، إعداد محمد بن غالب العوفى، إشراف أ.د. مازن فارس رشيد.

٣- الثقافه التنظيمية ودورها فى رفع مستوى الأداء، إعداد زياد سعيد الخليفه، إشراف أ.د. عبد الحفيظ مقدم.

٤- الثقافه التنظيمية فى المنظمات الأمنية ودورها فى تطبيق الجودة الشاملة، إعداد جاسم بن فيحان الدوسرى، إشراف أ.د. سالم بن سعيد القحطانى.

٥- لليوم أهميته، جون سى. ماكسو.ل.

# سێ سیفەت بۆ جوانترکردن و خۆشەویستبوونی سەرکردە

کاروان ڕەشید محێدین

### ١. ڕەوشتێکی ڕاستو دروست:

پێویستە خووڕەوشتی سەرکردە هەڵقوڵاوی ناو باخچەو گوڵزاری ڕەوشتە ئاینییەکان بێت، بەو ڕەوشتو سیفەتانە خۆی برازێنێتەوە کە لەگەڵ ئاینو کلتوری نەتەوەکەیدا یەك دەگرنەوە، خوڕەوشتێك لە لایەن خواو پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەربێت) فەرمانی پێکراوە، هەمان کات خەڵکیش زۆر بە جوانی باسی دەکەن، بەڵێ بە درێژایی مێژوو هە موو سەرکردە سەر ڕاستەکان بەو سیفەتە جوانانە خۆیان ڕازاندووەتەوە لە پێشینە چاکەکانمانو ئەوانەشی بە دوای ئەواندا دێن، پەروەردگار بە ئایەتی -وانك لعلی خلق عظیم- باس لە ڕەوشتی پێغەمبەری خوا دەکات، ئیدی با پێغەمبەر یوسف لەو لاوە بووەستێت کە بە هۆی ڕەوشتە جوانەکانییەوە توانی بگاتە ئاستێك کە گەنجینەکانی میسر بگرێتە دەست.

### ٢.هاوتابوونی وتەو کردارەکانمان بە یەکتری:

ئەگەر تۆ متمانە نەدەیتە خۆت بۆ هەڵگرتنی پەیامێك، چۆن دەتوانیت بروا بە ناوەڕۆکی ئەو پەیامە بکەیت. بەڵێ یەکێکی دی لەو سیفەتانەی کە پێویستە لە سەرکردەدا بوونی هەبێت، بریتییە لە هاوتا بوونی وتەو کردارەکانی سەرکردە بە یەکتر، چەندە توانای خزمەتکردنی گەلی هەیە با ئەوەندە بەڵێنیان پێ بدات، چەند توانای سەربازیو سوپای بەهێزە، با بە پێی سەنگو قورسایی هێزەکانی بڕیار بدات نەك چەواشە کردنی میللەت، پێویستە سەرکردە لەگەڵ دەوروبەریدا ڕاستگۆیانە بڕیار بدات، چی دەڵێت بە جوانی جێبەجێی بکات.

### ٣- هەڵگرتنی لێپرسراویەتی:

یەکێکی تر لەو ڕەگەزانەی کە پێویستە لە سەر کردەدا بوونی هەبێت، هەروەك ڕاستگۆیی سەرکردەش دەردەخات، ئامادەبوونی سەرکردەیە لە چوونە ژێر باری هەموو لێپرسراویەتییەکان، دەبێت بچێتە ژێر باری زیانو سودی سەرجەم ئەو بڕیارانەی کە دەریان دەکات، ئەگەر سەرکردە بەو شێوازەی کرد ئەوا زیاتر لە جاران لە ناو چینە جیاوازەکانی گەلدا خۆشەویستتر دەبێتو زیاتر پشتگیری دەکەن، بەڵام لەم سەردەمەی خۆماندا دەبینین زۆربەی سەرکردەکان لە لای گەلەکانیان متمانەیان لە دەستداوە، چونکە خۆیان بوونەتە هۆکاری بەش مەینەتی گەلەکانیانو بەبێ سەیرکردنی داهاتوو بێ هیچ لێکدانەوەو تێبینی کردنی باروودۆخە سیاسییەکە، بڕیاری نارۆشن دەردەکەنو تەنها گەلیش لەم بوارەدا زیانی بەر دەکەوێتو لە کاتی تەنگانەشدا نا بەرپرسانە گەلەکانیان بە جێ دەهێڵن، بەڵام ئەگەر سەرکردە حەکیمو لێهاتوو بوو، ئیدی شوێن کەوتووەکانی بەردەوام پشتی پێدەبەستنو بروایان بە ڕاستگۆیی سەرکردەکەیان هەیە.

بەشی یەکەم

# فەلسەفەی کاری دامەزراوەیی و تایبەتمەندییەکانی

و: عومەر عەبدولقادر

یەکەم: چەمکی کاری دامەزراوەیی: کاری دامەزراوەیی، (یان کارکردن لە میانەی دامەزراوەدا، یان کارکردن بە بیرکردنەوەی دامەزراوەیی)، ئاماژەیە بۆ هاوکاری نێوان خەڵکیو ئارەزوویان لە پەسەندکردنی کاری بە کۆمەڵ، یان ئەوەی پێی دەوترێت کاری هەرەوەزیو پێکەوەیی، بە جێهێنانو ئەنجامدانی ئەم جۆرە لە کارکردن پێویستی بە هەماهەنگیو دڵسۆزییو شێوازێکی ڕێکوپێکو ڕێکخراو هەیە، کە بەندە بە کۆمەڵێك بنەماو بەهاو بنچینەی ڕێکخستنکاری دیاریکراوەوە.

ئامانج لە پیادەکردنی کاری بە کۆمەڵ بەشداری پێکردنی تواناو هەوڵی هەمووانو ئاسانکاریکردنە لە بەڕێوەبردنی کارە گشتییەکاندا.

بەوپێیەی لە ئەمڕۆدا (وەك دەوترێت) شوێنێك نەماوە بۆ کاری تاکەکەسی، کەواتە کاری دامەزراوەییو بە کۆمەڵ لە جیهانی ئەمڕۆدا تەنها هەڵبژاردنێکی ئاسایی نییە، بەڵکو پێویستییەکە بۆ مانەوەو پارێزگاریکردن لە بوونو کێبڕکێکردن لە پێناو پێشکەشکردنی باشتریندا.

کاری دامەزراوەیی گرنگییەکی زۆری هەیە، چونکە شێوازی کار دەگوازێتەوە: لە تاکە کەسییەوە بۆ بە کۆمەڵ، لە هەڕەمەکییەوە بۆ پلاندانان، لە شاراوەییو نهێنییەوە بۆ ڕوونو ئاشکرایی، لە کەمی دەرامەتەوە بۆ زۆری دەرامەت، لە کاریگەری بەرتەسکەوە بۆ کاریگەری بەرفراوان، لە دۆخی نەریتییەوە بۆ دۆخی یاسایی.

هەروەك هەر کەسو لایەنێك بیەوێت دەست بکات بە کاری دامەزراوەیی پێویستە کۆمەڵێك سیفاتی تێدا بێت، گرنگترینیان: کرانەوەو پێگەیشتوویی، بوێرییو دەستپێشخەرییو داهێنانسازی، بیرکردنەوەی ئەرێنی، کارامەییو لێهاتوویی پێویست بۆ بەڕێوەبردنو سەرپەرشتیکردن.

هەروەها چەند مەرجو ڕەگەزێکی گرنگ هەن کە پێویستە لە دەستپێکی بنیادنانی کاری دامەزراوەییدا لە بەرچاوبگیرێنو فەراهەم بکرێن، بە کورتی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١- ڕوونی ئەو ئامانجو بیرۆکەیەی کە دامەزراوەکە لە پێناویدا بە دیهاتووە.

٢- شایستەیی دامەزراوەکەو بە دەستهێنانی ڕەزامەندیو ڕێگەپێدانی یاسایی بۆ دەستپێکردنی کارەکە، بە گوێرەی مەرجەکانی ئەو ڕێگە پێدانە.

٣- بوونی سەرکردایەتییەکی شیاو ڕێزدارو بە تواناو چالاكو یەکلایی کەرەوە بۆ کاروباری دامەزراوەکە.

٤- تەرخانکردنی سەرمایەی تەواوو پێویست لە ڕێگەی سەرچاوەی دەستەبەرکردنی سەرمایەی خودی دامەزراوەکەو لایەنە جیاوازەکان بە شێوەیەکی بەردەوام، لەگەڵ پارێزگاریکردن لە سەربەخۆیی هەڵسوکەتو مامەڵە کردن، بوونی سیستەمێکی داراییو ژمێریاری وردبینو سەرکەوتوو.

٥- بە دەستهێنانی ناوبانگی باش بۆدامەزراوەکەو چەسپاندنی لە تێڕوانینی کارمەندانیو ئەو کەسانەش کە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، دەنگدانەوەی لە لای کێبەڕکێکارانی دامەزراوەکە.

٦- بە توانایی دامەزراوەکە لە دەرکردنی بڕیارەکانیدا بەبێ ڕێگەدان بە دەستێوەردانی لایەنی دەرەکی، هەروەها بە دیهێنانی ئامانجەکانیو زاڵبوون بە سەر کۆسپەکانداو ناچارکردنی کەسانی تر بە پەسەندکردنی بەرنامەو شێوازی پەیڕەوی کارکردنی دامەزراوەکە.

٧- ڕاکێشانی ژمارەیەکی باش لە کارمەندانی لێهاتوو شارەزا، کە بە باشی توانای جێبەجێکردنی پلانەکانو ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانیان هەبێت.

٨- دانانی پلانو بەرنامەو پەیڕەوێکی دیاریکراوو ڕوونو ئاشکرا بۆ کارکردن کە لێکۆڵینەوەی لە سەر کرابێت، هەمووان هاوڕابن لە سەریو تۆمار بکرێتو بچەسپێنرێتو بگونجێت لەگەڵ ئامانجەکانی دامەزراوەکەدا، هەموو ئەو لایەنانەش کە پەیوەندیدارنو مامەڵە لەگەڵ دامەزراوەکە دەکەن لێی ئاگادار بکرێنەوە.

٩- بوونی سیستەمێك بۆ چاودێریکردنو بە دواداچوونو هەڵسەنگاندنی بەردەوام بە مەبەستی دڵنیابوون لە سەلامەتی پلاندانانو جێبەجێکردن.

سەرچاوە/ العمل المؤسسي/ د. محمد أکرم العدلوني ص/ (٢٠-٢٤)

# منداڵێك باسی خۆی دەكات

**لە كاتی مەلەوانی لە مەلەوانگەدا:**

منداڵان ئێستا وەرزی هاوینەو كاتی پشووی قوتابخانەیە، یەكێك لەو وەرزشانەی سوودی زۆری هەیە بۆ لەشو دەروونی مرۆڤ، وەرزشی مەلەوانییە، بۆیە لە كاتی سەردانكردنو ئەنجامدانی ئەم وەرزشە لە مەلەوانگەدا، منو ئێوەش با ڕەچاوی ئەم خاڵانە بكەین:

- كاتێك من بۆ بەسەربردنی كاتێكی خۆشو بەسوود دەچمە مەلەوانگە بۆ مەلەكردن، دیارە بە هەمان شێوە منداڵانی تریش بۆ ئەم مەبەستە دێنە مەلەوانگە، لەبەرئەوە پێویستە بە شێوازێكی نەرمونیان و ڕێكوپێك هەڵسوكەوتو مامەڵەیان لەگەڵدا دەكەمو بێزارو هەراسانیان ناكەم.

- من بەر لە چوونە ناو مەلەوانگە، لە شوێنی تایبەتی مەلەوانگە خۆم دەشۆم، تاكو پارێزگاریی لە پاكوخاوێنی ئاوی مەلەوانگەكە بكەم، چونكە زۆرێك لە منداڵانی تریش وەك من مەلەوانی تێدا دەكەن.

- پاكوخاوێنی ژوورو كابینەی خۆشووشتنو جل گۆڕین دەپارێزم.

- لە بەرامبەر منداڵانی تردا خۆم ناگۆڕم، چونكە ئەمە كارێكی نەشیاوە.

- پارێزگاری لە خاوێنی ئاوی مەلەوانگەكە دەكەم، تاوەكو خۆمو منداڵانی تری هاوڕێم دووربین لە هەر زیانێكی دژی تەندروستیمان.

- دەستكاریی شمەكو كەلوپەلی ئەوانە ناكەم كە لەوێ مەلەوانی دەكەن.

- دەستەسڕو پاشماوەی خۆراك فڕێ نادەمە سەر زەوی مەلەوانگەو و ناو حەوز، یاخود ناو لمی كەناراوەكە، بە تەواوی پارێزگاری لە خاوێنی ئەو شوێنە دەكەم كە مەلەوانی تێدا دەكەم.

- ئەگەر كەسێك ببینم ئازارێكی پێ دەگاتو زامدار دەبێت، ئەوا بەخێرایی یارمەتی دەدەمو داوای یارمەتی لە بەرپرسی مەلەوانگەكە دەكەم.

- سەیری ئەوانە ناكەم كە خەریكی پشوودانو نانخواردن بن.

- گاڵتە بەوانە ناكەم كە مەشقو ڕاهێنان دەكەن تاكو فێری مەلەوانی كردن ببن.

- ئەگەر هەر كەلوپەلێكم لە شوێنێكی مەلەوانگەكەدا دۆزییەوە، ئەوا یەكسەر دەیدەمەوە دەستی یەكێك لە بەرپرسانی مەلەوانگەكە.

# منداڵانی ئازیز، نەوجەوانانی خۆشەویست

ئێوە پیاوانو ئافرەتانی سبەینێنو هەمووان چاوەڕوانی دەستو مەچەكو بیروتوانای ئێوەینو دەمانەوێت لە ئێستاوە پیاوانە مامەڵە بكەنو لە ئاستی لێپرسراوێتی دا بن، كوڕانتان با هاوڕێیەكی نزیكی باوكان بنو پرسیارو تێبینییەكانتان بە ڕاشكاوی ئاراستەیان بكەنو لە ئەزموونو زانیاریەكانیان سوود وەربگرنو هەر ڕووداوێكی لە ناكاو كە دەبێتە مایەی سەرسوڕمانو نیگەرانتان دەكات، دەستبەجێ لەگەڵ باوكتاندا دانیشنو بە هێمنی گفتوگۆی لەسەر بكەنو بە شێوەیەك لە یەكتر نزیك ببنەوە تا هیچ ڕازو نیازێكتان لە یەكتر شاراوە نەبێت.

كچانیش با لە دایەگیان نزیك ببنەوەو وەكو خۆشەویستترینو دڵسۆزترین هاوڕێ مامەڵەیان لەگەڵدا بكەن، دڵنیاش بن كە هیچ هاوڕێیەك نییە هێندەی دایە دڵسۆز بێتو شایانی ئەوە بێت كە ئێوە گرێی دڵتانی لا بكەنەوە، دەبا بۆ هەموو ڕازونیازو پرسو ڕایەك ڕوو بكەینە دایكی ئازیزمانو لە ژیانو تەمەنو ئەزموونیانن سوود وەربگرین.

بێگومان ئەگەر وا بكەین ئەوا سوودمەند دەبینو خۆمان لە كەوتنە نێو هەڵەی گەورەو ترسناك دەپارێزینو كەسێكی سەركەوتوو دەبین.

# ڕێوییەکی زیتەڵە

سارا

لە دارستانێکی دڵرفێنو هەمیشە سەوزی دوور لە ئاواییدا، کۆمەڵێك ڕێوی لە نزیك کانیاوێکی ساردو خۆشدا دەژیان...

ڕێوییەکان پارێزگارییان لە کانیاوەکە دەکردو ڕێگەیان نەدەدا گیاندارانی دیکەی نێو دارستان لە کانیاوەکە نزیك ببنەوەو سوودی لێوەرگرن..

گیاندارەکان بۆ دەستخستنی ئاو کە پێداویستییەکی سەرەکی ڕۆژانەیان بوو، بە ناچاری دەڕۆیشتن بۆ دارستانەکانی دەوروبەریان، چونکە هەموو گیاندارە هەژارو بێ دەسەڵاتەکان لە ڕێوییە دڕندەکان دەترسان..

هەر بۆیە ئەم گیاندارە هەژارانە دەبوایە هەموو ڕۆژێك ڕێگەیەکی دووریان ببڕیایە لە پێناوی دەستکەوتنی ئاوی خواردنەوە... هەرچەندە ڕێگەکەیان زۆر دووربوو، ڕۆژانە زۆر ماندوو دەبوون، بەڵام چارەیەکی دیکەیان نەبوو..

ڕۆژێکیان ڕێوییە زیتەڵەکە لە دڵی خۆیدا وتی: بۆچی ڕێوییەکانی هاوڕێم ڕێگە نادەن گیاندارانی دارستان سوود لە ئاوی کانیاوەکە وەرگرن؟ خۆ ئاو موڵکی هەمووانەو دەبێت هەمووان پێکەوە سوودی لێ وەربگرین...

بە ڕاستی ئەمە خۆپەرستیو خۆبەزلزانینی ڕێوییەکانە...

لە کاتێکدا ئاوی کانیاوەکە زۆرە، بەڵام جگە لە ڕێوییەکان هیچ گیاندارێك سوود لە ئاوەکە نابینێت..

ئەوانیش ڕۆژانە بە هەدەری دەبەنو لە ڕادەبەدەر بە کاری دەهێنن بۆ خۆیانو ئەوانی دیکەشیان لێ بێبەش کردووە..

کەواتە بۆ دەبێت ڕێگە نەدرێت ئاژەڵە هەژارەکان ئاوەکە بە کاربهێنن، لە کاتێکدا ئەگەر هەموو گیانداران ئاوەکە بەکار بهێنن بە درێژایی ساڵ بەشی هەموویان دەکات..

بۆ ئەم مەبەستە ڕاوێژی بە ڕێوییە بچووکەکانی هاوڕێی کرد..

هەموویان وتیان: بە ڕاستی نەریتێکی ناشیرینو خراپە، پێویستە ئەم یاسایە بگۆڕین..

ڕێوییە بچووکەکان بە سەرکردایەتی ڕێوییە زیتەڵەکە ڕۆیشتن بۆ لای سەرکردەی ڕێوییەکان..

داوایان لێکرد ئەم یاسا خراپە هەڵوەشێنێتەوە..

بەڵام سەرکردەی ڕێوییەکان داواکەی پەسەند نەکردو هاواری کرد بە سەر ڕێوییە بچووکەکاندا تا بڵاوەی لێ بکەن.

بەڵام ڕێوییە زیتەڵەکە سووربوو لە سەر داواکەیو وتی: ئەگەر ئەم یاسایە نەگۆڕیت ئەوە سەرپێچی فەرمانەکانت دەکەینو یاخیبوونمان ڕادەگەیەنین..

ئیدی ڕێوییە بچووکەکان یاخیبوونو هەڵگەڕانەوەو سەرپێچیان لە تەواوی یاسا خراپەکانی باوانیان ڕاگەیاند..

بڕیاریان دا لە مەودوا پاسەوانی کانیاوەکە نەکەنو ڕێگە لە هیچ گیاندارێك نەگرن کە بە نیازی ئاوخواردنەوە دێنە سەر کانیاوەکەو ئەم یاخیبوونەشیان لە نێو دارستاندا بڵاوکردەوە..

سەرکردەی ڕێوییەکان کاتێك زانی چارەیەکی نییە، چونکە تەواوی ڕێوییە بچووکەکان هاوڕا بوون لەگەڵ ڕێوییە زیتەڵەکە، دوای ڕاوێژکردن بە جێگرەکەی، یاساکەی هەڵوەشاندەوەو بڕیاری دا لە مەودوا هەموو گیانداران مافی خۆیانە لە کانیاوەکە ئاو بخۆنەوە.

گیاندارانی دارستانەکەش زۆر سوپاسی ڕێوییەزیتەڵەکەو هاوڕێکانیان کرد..

لەو ڕۆژە بە دواوە هەموو گیانداران بە ئاشتیو ئارامیو برایەتی لە نێو دارستانەکەدا پێکەوە دەژیان ..

بێگەرد فارس

# گەر دەتەوێت بەرهەمی باش هەبێت، پێویستە تۆوی باش ببەخشیت!

لە پێشبڕکێی ساڵانەی باشترین جۆری گەنمەشامیدا جوتیارێك چەندین جار ئەو خەڵاتەی وەردەگرت، كە بۆ ئەو مەبەستە تەرخان كرابوو، ڕۆژێك ڕۆژنامەنوسێك دیمانەیەكی لەگەڵ سازكردو لە هۆكاری سەركەوتنی بەردەوامو یەك لە دوای یەكی پرسی، ئەو دەیزانی كە جوتیارەكە پێش چاندنو وەرزی گەنمەشامی باشترین جۆری تۆوی گەنمە شامی لەگەڵ دراوسێكانیدا دەگۆڕێتەوە، بۆیە لێی پرسی: تۆ دەزانیت دراوسێكانت لە پێش بڕكێكەدا ڕكابەریت دەكەن، بۆچی لە باشترین جۆری تۆویان دەدەیتێ؟!

جوتیارەكە بەوپەڕی ڕێزەوە وەڵامی دایەوەو وتی: ئایا نازانیت شنەی با دەنكە هەڵاڵەكان هەڵدەگرێتو لە كێڵگەیەكەوە بۆ یەكێكی تری دەیانگوێزێتەوە؟

كاتێك دراوسێكەم تۆوی خراپو بێ كەڵك دەچێنێت ئەوا دەنكە هەڵاڵەی ئەو ڕووەكە بەرەو كێڵگەكەی من دێتو دوای كرداری پەڕین، پیتێن ڕوودەدات لە نێوان دوو ڕووەكدا كە یەكێكیان باشو ئەوی تر خراپ، ئەو كاتە بەرهەمەكە بەرهەمێكی باش دەرناچێتو كێڵگەكەی منیش ڕووبەڕووی خراپ بوونو تێكچوون دەبێتەوە!

بۆئەوەی بەرهەمێكی باشو بەكەڵكم دەست بكەوێت پێویستە لە باشترین جۆری تۆو بدەمە دراوسێكانم، لە ئەنجامی ئەو كارە دراوسێكانم سوودمەند دەبنو منیش باشترین بەرهەمی گەنمەشامی دەدوورمەوە!

كەواتە ئەگەر بەرهەمێكی باشم بووێت پێویستە لە باشترین جۆری تۆو بدەمە دراوسێكانم.

ئەو جوتیارە باش دەزانێت كە شتەكانی دەوروبەرمان چۆن كارلێك دەكەن لە ژیاندا، بەرهەمی باش نابێت تەنها بەوە نەبێت هاوكاری كەسانی تر بكات. یاخود ئەوەی خۆی هەوڵی بۆ دەدات بۆ سەركەوتنو بە دەستهێنانی ژیانێكی خۆشو ئاسوودە تۆوی بەختەوەری دەبەخشێتە دەوروبەرەكەی ...

ئەمەش بۆ هەموو بوارەكانی ژیان دەگونجێت، كێ دەیەوێت بە ئارامی بژی پێویستە یارمەتی كەسانی تر بدات ئارام بن، گەورەیی مرۆڤ لە مەودای كاریگەری لەسەر ژیانی كەسانی تر بۆ ژیانیان بە بەختەوەری دەپێورێت، چونكە بەختەوەری كۆمەڵ بە تاكەوە بەندە.

بەڵام ئەگەر بێتو تەنها بیر لە بەرژەوەندی خۆمان بكەینەوە ناتوانین سوود بە خۆمانو كۆمەڵگەش بگەیەنین.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت:»كەسێك ئیمانی نی یە ئەگەر ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براكەی پێی خۆش نەبێت»

یارمەتیدانی كەسانی تر یەكێكە لە بنەماكانی زیندووكردنەوەی گیانی سۆزو خۆشەویستی، پتەوبوونی پەیوەندی نێوانیانو پاشان بەدەست هێنانی دڵێكی ئارامو پڕ لەنووری ئیمان.

شارەزایانی پزیشكی لە لێكۆڵینەوەیەكدا سەلماندوویانە كە گیانی یارمەتی نێوان مرۆڤەكان دەبێتە هۆی هێوربوونەوەی كرژی دەمارەكانو هەستكردن بە ئارامی دەررونی، ئەمەش لە ئەنجامی هاوكاریكردنی كەسێكدا هانی دەردانی هۆرمۆنی ئەندورفین دەدات كە دەبێتە هۆی هەست كردن بە ئارامی دەروونی. سەرەڕای كەم كردنەوەی پەستانی زۆر، یارمەتی ئەوە دەدات كە ئەو كەسە بیركردنەوەی لەكێشەو ناخۆشییەكانی كەم بكاتەوە ئەمەش وا دەكات كە هەست بە ئاسوودەیی بكات.

كەواتە هەموو یەكێك لە ئێمە دەتوانین هۆكارێك بین بۆ یارمەتی، یان ئاسانكردنی كارێك لەسەر ئەوانەی لە توانایاندا نییە بە دەستی بهێنن، بێ ئەوەی بیر لە پاداشت، یان بە دەستهێنانی شتێكی گەورەتر لە بەرامبەریدا بكاتەوە، چونكە ئەگەر بەرژەوەندی نەبوو لە كردنی كارێك ئەوا ڕێزو سۆزو خۆشەویستی بەرامبەر بە دەست دەهێنین.

# بنەمای بەڕێوەبردنی کوالێتی

بەشی سێیەم و کۆتایی

ئا: ئیبراهیم مستەفا خدر

**بنەمای شەشەم: چاکسازی بەردەوام (Continual Improvement)**

چاکسازی بەردەوامی کارەکانی ڕێکخراو دەبێ لە پێناو ئامانجێکی دیاریکراو بێت، لەو حاڵەتە توانای ڕێکخراو چاکسازی دەکرێتو چالاکییەکانی بەرەو گەشەسەندن دەبات. چاکسازی بەردەوام وادەکات کە بەڕێوەبەران بتوانن کەمو کورتییەکان داپۆشنو ڕێکخراو بگاتە لوتکەی ئامانجە دیاریکراوەکانو لە کۆتاییدا چاکسازی بەردەوام وادەکات کە ڕێکخراو دەرفەتی ئەوە پەیدا بکات لە کاتی پێویست وەڵامی ئەو دەرفەتانە بداتەوە کە ڕووبەڕوی دەبێتەوە.

بەکارهێنانی بنەمای چاکسازی بەردەوام دەبێتە هۆی:

١- دروستکردنی پرۆسەیەکی تەواوو سازگار لە ڕێکخراو بۆ چاکسازی بەردەوامی کارەکان.

٢- سەرچاوەکانی مرۆیی ئاشنا بە شێوازەکانی چاکسازی بەردەوام دابین بکرێت.

٣- چاکسازی بەردەوام لە بەرهەمەکان، پرۆسەو سیستەمەکان ئامانجێکی دیاریکراو بۆ یەکە یەکەی فەرمانبەران پێناسە دەکات.

٤- چاکسازییەکانی بە کارهاتوو دەناسرێتەوەو دەخرێتە مەیدانی کارکردن.

**بنەمای حەوتەم: بڕیاردان بە پێی ڕاستییەکان: (Factual Approach to Decision Making)**

لە هەموو ڕێکخراوێک بڕیارەکانی ڕاستەقینە بە پێی شیکردنەوەی داتاکانو بەرهەمهێنانی زانیارییەوە دەبێت. بڕیارەکانی دروست، زیاترکردنی توانایی بۆ دیاریکردنی کاریگەری لەسەر بڕیارەکانی ڕابردوو، نەمانی بەربەست، گۆڕان لە شێوازەکانی بیرکردنەوە، هەموو لە ئەنجامی بڕیاردان بە پێی ڕاستیەکانەوە دەبێت.

بەکارهێنانی بنەمای بڕیاردان بە پێی ڕاستییەکان دەبێتە هۆی:

١- متمانە پەیداکردن لە وردیو دروستی زانیارییەکان.

٢- خستنەڕووی داتاکان بۆ ئەو کەسانە کە پێویستیانە.

٣- شیکردنەوەی داتاو زانیارییەکان لەسەر بنەمایەکی ڕاستەقینە.

٤- بڕیاردانو کردارەکانی ئیجرایی لەسەر بنەمای شیکردنەوەی ڕاستەقینەو سوود وەرگرتن لە ئەزموونی کەسانی دەوروبەر ئەنجام دەدرێت.

**بنەمای هەشتەم: پەیوەندی سوودمەندو دوولایەنە لەگەڵ دابینکەران (Mutually Beneficial Supplier Relationships)**

ڕێکخراوو دابینکەرانی پەیوەندییەکی سوودمەندو دوولایەنەیان هەیە، بوونی ئەو پەیوەندییە توانای هەر دوو لایەن زیاد دەکات بۆ قازانجێکی زیاتر. زیاتر کردنی توانای هەردوولا لە ئەنجامی لێکگەیشتنو خێرایی لە وەڵامدانەوە بە گۆڕانکارییەکانی بازاڕ، یا خود پێداویستیو چاوەڕوانی کڕیارەکانەوە دروست دەکرێتو دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی تێچوونەکانی هەردوولا.

بەکارهێنانی بنەمای پەیوەندی سوودمەندو دوولایەنە لەگەڵ دابینکەران دەبێتە هۆی:

١- پەیوەندییەکی هاوسەنگ لە نێوان تێبینییەکانی ماوە کورتو ماوە درێژ دروست بکرێت.

٢- پسپۆڕیو سەرچاوەکان بە هاوبەشی لە نێوانیاندا دابنرێت.

٣- باشترین دابینکەر دەستنیشان بکرێت.

٤- پەیوەندییەکی ڕوونو ئاشکرا لە نێوانیاندا دروست بکرێت.

٥- زانیارییەکانو پلانەکانی داهاتوو لە نێوانیاندا بە هاوبەشی دابنرێت.

٦- دابینکەران بۆ ناسینەوەو پەیداکردنی ڕێگاکانی چاکسازی دڵ گەرم دەبن.

سەرچاوە/ ئینتەرنێت.

# تەورەکەت مەکە بە پیك؟

و: دڵنیا جەعفەر

ڕۆژێکیان داربڕێکی زۆر بەهێزو بازوو بە دوای کاردا دەگەڕا، دوای ئەوەی ئەو کارەی حەزی لێبوو دۆزییەوە، زۆر خۆشحاڵو شادمان بوو، خۆشحاڵی بە ڕووخساری گەشو زەردەخەناوییەوە دیار بوو...

ڕۆژی یەکەم چووە سەر کار، خاوەنکارەکەی تەورێکی دایە دەستیو شوێنی کارکردنەکەی نیشاندا، تا کاری تێدا بکات، ئەو ڕۆژە داربڕەکە هەژدە داری بڕییەوە، خاوەنکارەکەی بە بینینی بەرهەمی کاری داربڕەکە سەری سوڕما! سوپاسی داربڕەکەی کردو داوای لێکرد بەردەوام بێت لەسەر کارەکەی. هەرچەندە داربڕەکە کرێیەکی باشیان پێ دەدا لە بەرامبەر ئەو کارەی ئەنجامی دەدا، بەڵام دەیویست زۆر زیاتر هەوڵ بداتو شوێن پێی خۆی بە تەواوەتی بکاتەوەو کارەکەی مسۆگەر بکات. بە تایبەت لەو هەموو پیاهەڵدانەی خاوەنکارەکەی، زۆر زیاتر هەوڵیدا، خۆشەویستی بۆ کارەکەی وای لێ دەکرد زۆر زیاترو باشتر بێت لە کارەکەیدا، بەڵام ڕۆژی دواتر پانزە داری بڕییەوەو نەیتوانی وەك ڕۆژی یەکەم هەژدە دار ببڕێتەوە، ڕۆژی سێیەم زۆر زیاتر خۆی ماندوو کرد، بەڵام تەنها (١٠) داری بڕییەوە.

ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی ئەو دارانەی دەیبڕییەوە کەمی دەکرد، سەرەنجام داربڕەکە داوای لێبووردنی لە خاوەنکارەکە کردو وتی: نازانم، تێناگەم، بۆ ناتوانم وەك ڕۆژی یەکەم بە باشی کار بکەم؟ زۆریش هەوڵ دەدەم، بەڵام ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژمارەی ئەو دارانەی دەیبڕمەوە کەمتر دەبێت!

خاوەنکارەکە پرسی: (کۆتا جار کە تەورەکەت تیژ کردەوە چ کاتێك بوو؟)

داربڕەکە کەوتە بیرکردنەوەو بە سەرسوڕمانەوە وتی: من بە هیچ شێوەیەك دەرفەتی تیژکردنەوەی تەورەکەم نەبووە، هێندە سەرقاڵی بڕینەوەی دار بووم کە تیژکردنەوەی تەورەکەم بیرچوو بوو.

خاوەنکارەکەش وتی: گەر دەتەوێت وەکو یەکەم ڕۆژ بەرهەمی باشت هەبێت، تەورەکەت مەکە بە پیك!!

ژیانی ئێمەش وەك ئەم چیرۆکەیە، ئێمە هێندە سەرقاڵی ژیان بووین، دەرفەتمان بۆ تیژکردنەوەی تەورەکانمان نییە لە دونیای پڕ جەنجاڵی ژیاندا. ئەمڕۆ مرۆڤەکان زۆر سەرقاڵترن لە ڕابردوو، بەڵام کەمتر لە ڕابردوو هەست بەڕازیبوونی ژیان دەکەن، ئەمە هۆکاری چییە؟

پێ دەچێت تیژکردنەوەی تەورەکەمان بیرچووبێت، پێویستە جارناجار دەرفەت بۆ بینینی خۆشەویستانمان بدۆزینەوە، بخوێنینەوە، پشوو بدەین، هەوڵ بدەین شتی نوێ فێربین.

سەرچاوە/ ڕاه زندگی ژمارە (٢٣٦)

و/ ئەسکەندەر رەحیم

# خەونو ڕاستی!!!

باسکاڵ کرۆچی دەڵێ: ڕۆژێکیان خەوتبووم.. خەونێکم دی. خەونەکشم ئەمە بوو:

نامەیەکم لە پارێزەرێکی بەناوبگەوە بەدەست گەیشت. پارێزەرەکە پێی ڕاگەیاندم کە خزمێکم پاش مردنی.. سامانو دارایییەکی بۆ بەجێ هێشتووم، کە بە یەك ملیۆن دۆلار مەزەندە دەکرێ.. بەڵام وەسێتنامەکە، مەرجێکی تێدا هاتبوو.. داوای دەکرد بەسەر لوتکەی چیایەکی بەرزدا هەڵبگەڕێم، تا گەنجینەیەك کە لە لوتکەی چیاکەدایە هەڵبگرمەوە، کە نرخەکەی ملیۆنێك دۆلار بوو. ئەوسا ئەو کەلەپورو میراتییەی بەجێی هێشتووە، دەبێتە هی خۆم. واتە دەسکەوتەکەم دەبووە دوو ملیۆن دۆلار.

لە خەونەکەمدا.. بەسەر چیاکەدا هەر هەڵدەگەڕام.. بەر لەوەی بگەمە گەنجینەکە، هاوڕێکانم خەبەریان کردمەوە. پاشان لە ماناو مەبەستی خەونەکەم گەیشتم. هەرچی چیاکەیە، ئەوە گەشتی کاری منە، کە هەر دەبێ بیگرمەبەر.. بۆ ئەوەی چەندەم سامانو دارایی دەوێ بەدەستی بهێنم.

پاشان سەرکۆنەی خۆمم کرد.. لەسەر چی؟! لەسەر ئەوەی خەونم بە بەکرێگرتنی هالی کۆپتەرێکەوە نەدیوە.. بۆئەوەی تا سەر لوتکەی چیاکە پێی بفڕیمایەو بەر لەوەی هاوڕێیانم بێدارم بکەنەوە، گەنجینەکەم بەدەست بهێنایە.

کەچی زۆرجار لە ژیانی ڕاستینەی خۆماندا.. ناچار بەس بە دەستو قاچو شانو قۆڵی خۆمان، چنگە کرێ دەکەینو بەسەر چیاکەدا هەڵدە گەڕێین. لەوەش دژوارو نالەبارتر ئەوەیە: کەسێك شك نابەین.. لەو خەونە بێدارمان بکاتەوە!!!

# هەڵپەی سامانو نەمانی خۆشەویستی!

ئاوات ئالانی

ماڵی خۆشەویستی ڕووی لە ڕمانەو کەس ئاوڕی لێناداتەوە، زۆرینەمان بەرژەوەندی ماددی بە ئاقارێکی هەڵدێردا بردوینی، ئەستەمە بە سانایی بگەڕێینەوە بۆ ناو خودی خۆمانو ئەو جیهانە جوانە بدۆزینەوەو هەست بە سەکینەتو ئارامی بکەینو لەو چەند ساتەی ژیاندا کە ماوە کەشێکی هێمنو لێوان لێو لە یەکتر ویستی بخوڵقێنین، حەزی ماددیو ئارەزووی خاوەندارێتی لەم ڕۆژگارەدا، بینایی چاوانی لێڵ کردووە، ڕوانین بۆ دەوروبەرو هاوڕێیەتی کردن لە تەك ئەمو ئەو و خۆبردنە پێشەوە لە مرۆڤەکانی تر، بێگومان تارمایی بەرژەوەندی کەسیو تایبەتی لە پشتییەوە وەستاوە، ئەوەی پێمان خۆشە بۆ خۆمان هەمان بێت لە شتی باشو سوودبەخش، بۆ ئەوانی دی نەك هەر پێمان خۆش نییە، بەڵکو بە ڕۆیشتنی زەمەنو هەڵکشانی تەمەن، تەنانەت خۆشیمان لە خزم و دۆستو هاوڕێ دێرینەکانیشمان نایەت، ئەگەر لە ڕێگاو بان بەلایاندا گوزەرمان کرد بە سەدایەکی ناساز، سڵاوێکی ساردو سڕیان لێ دەکەین، بەوەش خۆمان فریو دەدەین کە بە مەرحەبایی و دەست هەڵبڕینێکی سەر جادە، بە تەواوی مافی هاوڕێو هاوسێو هاو شارییەکانمان داوە، دۆلارو دینار سەرتاپا خەونو خەیاڵی زۆرینەمانی کۆنترۆڵ کردووەو کۆششی بێسنور هەر بۆ مۆنۆپۆلکردنی ماددەیە، ڕامان لە لێدوانی شۆفێری پاسێك نموونەیەکی بەرجەستەیە، لە ڕێگادا بە نەنگی نازانیو بێسڵەمینەوە، بە سەرنشینەکەی تەنیشتی دەڵێ: با پاسەکە ڕاگرمو ئەو پێنج سەد دیناریانە بچنمەوە، ئەم شۆفێرە لە دیدگاو جیهان بینی خۆیەوە مرۆڤی لە مرۆڤ بوون خستووەو ئەو بەها بڵندەی کە خوا بە مرۆڤی بە خشیوە هێناوەتە ئاستی نزمی ماددەو ڕۆحی سەنگینی مرۆڤەکانی بە پارە شوبهاندووە.

ئەشێ ئەم پەتایە دزەی کردبێتە ماڵی دڵی هەریەکەمانەوەو پێمان نەزانی بێت، یاخود درکمان پێ نەکردبێت، کە ئەوە پەتایەکی ترسناکە، بە ڕادەیەك ترسناکە، دەگونجێ ژیان بکاتە گۆڕستانێکی خامۆش، چونکە ڕۆچوون لە زۆنگاوی ماددە دا، مرۆڤ دەکاتە ئامڕازو بەردەوام بێ جیاکردنەوەی حەرام و حەڵاڵو تەرخانکردنی کاتێك بۆ پشوو، هەوڵەکانی چڕدەکاتەوە بۆ پاوانکردنی سەروەتو سامانی زیاتر، بەو نیازەی تەنها ماددە، مایەی خۆش گوزەرانییە!

لە کاتێکدا ونبوون لە جیهانی ماددە دا، دۆزینەوەی بەهەشتی کامەرانی نییە، بە پێچەوانەوە شەڕو ئاریشەو کۆ ژانەکانی دونیا هەر لە سەر ماددەیەو هەموو سامانی دونیاش نا توانێت دڵی دایکێکی کوڕ کوژراو و ڕۆحی منداڵیکی هەتیوی بێ مەئوا ئاسودە بکات.

کاتێ لە نەخشەی ڕێگای ژیانا ماددە بووە ئامانجی سەرەتاو کۆتایی، ئیدی لێرەوە بەها ڕۆحیو ئەخلاقیو هەڵسوکەوتە جوانەکان، وەك مۆم بە تێپەڕبوونی زەمەن دەتوێنەوە، هەستی خۆ بە جیاواز زانینو گەورە زانین دڵان دەتەنێو دەتەزێنێ، خۆشەویستی بابای (ماددە پەرست) لە ناخی دەوروبەرەکەیدا سفر دەکاتەوە.

ئەوەشی کۆی دەکاتەوە پێناچێ پێ ڕابگات بیخوات، لێرەدا قسەمان لە سەر ئەوە نییە، کە کۆشش نەکرێت بۆ پەیدا کردنی ڕۆزیو ڕاییکردنی ژیان بە سەربەرزی، نا ئەوە ئەرکێکی پیرۆزە، بەڵام ناکرێت تیشك نەخەینە سەر ئەو لایەنە تاریکەو ئەو دەستە پاوان خوازانەی، کە لە پێناو سامانی زیاترو زینەو کەمالیاتدا ئیستغلالی بازاڕیان کردووە، ئەرکی مرۆیانەی خۆیان لە یاد کردووەو ئامادەن بۆ بەدەستخستنی دراو، هەموو بەهاو نەریتە جوانەکان پێشێل بکەنو بە خۆشیان نەڵێن دۆڕاو، نا ئەشێ سنورێك هەبێت!

دەبێ بە ئیرادەیەکی بەرزەوە پێمان وابێت ئەوە دینار نییە، ئارامیو ئاسودەیی بۆ مرۆڤەکان دەستەبەر دەکات، بەڵکو ئەوە ماهییەتی (دینە) دینێك کە مرۆڤ نەیتوانی بێت دەستی تێوەربدات، شیاوی ئەوەیە دڵی بدەیتێو ڕۆحت ئارام بکەیتەوە.

چاوێ کە تەنها ژمارەو ڕەنگ و وێنەی سەر دراو دەبینێو لە ئاستی هەژارو بێنەوایاندا نەبینە، باشتر وایە بەر نەفرەتی کۆمەڵگا بکەوێت.

هەنوکە جەنگی ساردی خزمایەتی بۆتە دیاردەیەکی ناکۆتا، براو ئامۆزاو خزم و هاوڕێیان لەگەڵ یەکتر نا تەبان، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ سەردانو بە هاناوە

# چۆن ژیانم گۆڕا؟

هەوان سادە

چوون، ڕوو لە کەمییە، مەگەر هۆڵی پرسە کۆیان بکاتەوە، بە ڕامان لە دیرۆکی ژیانی ڕابـردوو دۆخی وا لە نـاو میللەتی کوردا بەدی ناکەی، بە تەنیا ژیانو دابڕان لەوانی دی هەرگیز لە پێشیندا مۆرکی کوردەواری نەبـووە، بە داخـەوە ئێسـتاکە ئەو بەها جوانانە فرۆشـراوە بە سـامان، دەتوانرێ بوتـرێ کۆی ئەو کێشـەو ئاریشـانەی لە کۆمەڵـگادا ڕوودەدەن، هۆکارەکەی نەمانی گیانـی لێبـوردنو وشـکبوونی کانیـاوی خۆشەیسـتییەو سەرەنجامەکەشـی بـە قەرەبروت بوونی ژیانە.

سـەرەڕای سـەرفکردنی کـۆی کاتەکانی تەمەن بۆ هەڵپەو ڕاوی دینار، ئەو دەرەنجامە نێگەتیفانـەی لێـی دەکەوێتـەوە کەمێکمان باسـکرد، زنجیـرەو سـریالی تیڤییەکانیـش کاریگەری گەورەیان هەیـە لە دابڕانی خزمو دۆستان لە یەکتری، لە جیاتی ئەوەی تیڤییەکان ئاستی ڕۆشنبیری (موتەلەقی) بەرز بکەنەوەو بینەر بە ئاراسـتەی پتەوکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا ببەن، بەڵام خەڵکیان توشی گۆشـەگیری کردووەو بەرنامە زۆرو زەوەندە تەرفیهییەکان تەمەڵیان خستووەتەوە، دواجار درکاندنی ئەم ڕاسـتییانە گەرچی تاڵیشـبن، پێم وایە خستنە ڕووی باشترە لەوەی کە هەر پێمان وابێت کۆمەڵگاکەمان بە تەواوی ساغو چاك و پاکەو لە واقیعیشـدا پەتایەکی ساری دابێتی بە سـەریاو تەندروستی لە مەترسیدا بێـت، بـەو هیوایەی لـە ڕێـی ڕاگەیاندنەوە بتوانیـن کانیـاوی سـازگاری بەختـەوەری بدۆزینەوەو دەسـتی خۆشەویستی بخەینەوە ناو دەستی ژیان.

کاتێـك بیر لە ڕابردوو دەکەمەوە زۆر ناخۆشـیـم دێتەوە یـاد. ڕۆژانی نەبوونیو شـەڕو نەخۆشـیو تاقیکردنـەوەکانو هەمـوو ناسـۆرییەکانی ژیـان، سـاتێك بەرەو ئـەو ڕۆژگارەم دەبەنـەوەو هەمان هەستم بۆ دروسـت دەبێت، هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشـمو وەکو مۆمێك هەناوم دەسوتێت. ئای کە ناخۆشە ڕابردووی تاڵ! خۆشی ڕەوێنی ئێستاو داهاتوو، لەناوبەری تیشکی سەرکەوتنو هیممەتی گۆڕان بەرەو چاکتر. بەڵام چی تێدایە ئەگەر تەنها بیر لـە داهاتوو بکەمـەوە، یـان تەنها پەندو ئامۆژگاری لە ڕابـردوو وەربگرم، ئەگەرنا تەنها لە بیری ئێستادا بم.

کەی بڕیاری یەکجارەکی بدەم بۆ گۆڕان؟ کـوا ڕێگای سـەرکەوتن؟ ئەی ژیان بەچی ژیانە، ئەگەر گۆڕانکاری تێدا نەبێت!

زۆر شـت لـە ژیانـدا کاریگـەری بەسەرمەوە هەبووە، بەڵام نەگەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی هەنـگاوی بۆ بهاوێم. ئەوەی ڕوویدا ڕۆیشت، تەنها تیشکێك دەخەمە سەر گۆشەیەکی ژیانم کە چۆن گۆڕا، کاتێك کە بۆ یەکەم جار بڕیارم خوێندەوە هەسـتم کـرد کە خۆم دۆزییەوە لە ناو دەریای بێ کۆتا، پاشـان کە دووەم ژمارەم خوێندەوە یەکسـەر بڕیـاری نووسـینی بابەتمدا کە زۆر لـە مێژ بوو بە ئاواتییەوە بووم. دوو مانگ سـەرقاڵی نووسـینەوەو ڕێکخستنی بابەتەکـە بووم زۆر بێزاری کردم، چونکە باسـی ناخۆشـییەکانی خۆمـی تێدابوو، بە ئیمەیڵێـك ناردمو هەندێکیش باسـی خـۆم بۆ سەرنووسـەر کردبوو. ئەوەی کە چاوەڕێم نەدەکرد ڕوویـدا، بە ئیمەیڵێك وەڵامی دامەوەو داوای لێکردم سـەردانیان بکەم! کاتێك سەردانم کردنو بە دیداریان شـاد بووم، داوایان لێکردم لەگەڵیاندا کار بکەم، منیـش کارەکەی خۆم جێهێشـتو پەیوەندیم پێوەکردن.

لێرەدا ژیانم دەسـتی بـە گۆڕان کرد، فێری زۆر شـت بوومو زۆر کار کە پێشتر ئەنجامـم نەدابـوو پێی هەڵسـام، چەند کتێبێکیشم خوێندەوە کە خۆم زۆر حەزم لە خوێندنەوەیەو ئەوانیش کاریگەرییەکی باشیان بەسەرمەوە هەبوو.

بـەڵام بابەتەکـەم بڵاونەکرایـەوەو داوایان لێکردم بابەتێکی باشـتر بنووسم، تاوەکـو سـەرەتایەکی چاکتـرم هەبێـت، منیش دڵم زۆر تەنگ بوو لەبەر سەرقاڵیم نەمتوانی جارێکی تر بینووسـمەوە. دواتر کارەکـەم جێهێشـتو دوای چەند مانگێك بـووم بە مامۆسـتاو تـەواوی ژیانم گۆڕا، دووبارە بابەتەکەم نووسـییەوەو ڕەوانەم کـرد دیسـان بڵاونەکرایـەوە، بـەڵام بێ ئومێد نەبووم.

دەسـتم کرد بە خوێندنـەوەی چەند کتێبێکـی ترو بـە تێڕوانینێکـی تازەوە هاتمـەوە مەیدان، هەڵسـام بەنووسـینی ئـەم بابەتـەی کـە ئێسـتا تـۆی بەڕێز دەیخوێنیتەوەو لەسـەر داوای سەرنووسەر ڕەوانەم کرد، ئێستاش بابەتەکەم ڕووناکی بینیو منیشـی زۆر دڵخۆش کرد، هەروەها هەر بەوەش نەوەسـتام لـە بواری تریش دەستم بە نووسین کردو هیوایەکی گەورەم بە دوارۆژ هەیە.

# با ڕەچاوی یاساکانی ژیان بکەین!

و: نیان حمەکریم

بەشی یەکەم

ژیان بە هەموو تاڵیو شیرینیەکانییەوە خاوەنی چەند یاسایەکە کە هەموومان ناچارین لە پێناو ژیانێکی باشتر پابەندبین پێیانەوە. ئەم یاسایانە یاساکانی سروشتیش لەخۆ دەگرێت کە ئێمە ناتوانین دەستیات تێوەربدەین.

یاساکانی سروشت:

ئەگەر لە ئاسانسۆرێکدا سەربکەویتو بتەوێت بڕۆیتە سەر بەرزترین کۆشکی شار، دواتر بێیتە خوارەوە، چی ڕوودەدات؟ بێگومان هێزی کێشکردنی زەوی ئەزموون دەکەیت.

بەڵام ئەگەر تۆ بڕوات بە هێزی کێشکردنی زەوی نەبێت، ئەودەمە چی ڕوودەدات؟ ئایا دەکەویتە خوارەوە؟

هێزی کێشکردنی زەوی خۆی بۆ خۆی یاسایەکی سروشتییەو گوێ بەوە نادات کە تۆ باوەڕت پێیەتی، یا نا، هەرچۆنێك بێت ئەو یاسایە بوونی هەیە. یاساکانی سروشت جیهانی بوونو ئەوەش کە لەو جیهانەدا هەیە بەڕێوەی دەباتو زاڵو باڵادەستە بەسەریدا. ئەم یاسایانە «جوڵەی کەشکەشانو ئەستێرەکان، هێزی هەڵکشانو داکشان، گۆڕانکاری وەرزەکان.....» بوون لە خۆ دەگرن. بەڵام تۆ لە ئاستی خۆتەوە دەتوانیت کە باوەڕت نەبێت پێیان، زۆربەی خەڵکی ئەم یاسایانەیان پەسەند کردووەو ئەوە دەزانن کە جیهان بە هۆی زۆرێك لەم یاسا نەبینراوانەوە کۆنترۆڵ دەکرێتو بەڕێوەدەبرێت، بەڵام خاڵی جێگەسەرنج لەمەدایە کە کاتێك قسەوباس دێتە سەر سەرکەوتنو شکستی خودی کەسەکانو مرۆڤ. باس لە چانسو بەختو نێوچەوان دەکرێت!! تۆ لە هەر جێگەیەکی دنیادا بیت، یا هەر کاروپیشەیەکت هەبێت، هەرچۆنێك بێت تەنها دوو ڕێگەت لەبەردەمدایە: دەتوانیت هاوڕێو هەماهەنگ بیت لەگەڵ ئەم یاسایانەو بە ئاراستەو مەبەستێکی پۆزەتیڤانەدا سوودیان لێوەربگریت، یا ئەوەی کە ڕووبەڕوویان ببیتەوەو لەگەڵیاندا وەشەڕ بێیتو قبووڵیان نەکەیت.

یاسای هۆو ئەنجام:

تۆ هەرگیز ئەم ڕستانە لە کەسێکەوە نابیستیت : «من ڕۆژانە بەیانیان زوو بەخەبەر دێمو وەرزش دەکەمو باش وانەکانم دەخوێنمو لە هەموو کاروبارەکانمدا تا ئەوپەڕی توانا هەوڵی خۆم دەدەم، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەنجامێکی باش و نێگەتیڤ وەدەست ناهێنم».

ئەگەر ژیانت ماندووکارانەو تەمەڵانەیە ئەوا لە خۆت بپرسە: بۆ سەرکەوتنو بەهرەمەندبوون لە ژیانێکی شادو پۆزەتیڤ من چەندێك هەوڵو کۆششم کردووە؟»

ژیانی تۆ وەك سیستەمێکی وزە وایە، ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کەلە وانەکانی فیزیادا خوێندووتە، بە واتایەکی دیکە

تۆ هەر چەندێك وزە بكەیتە ناو ئەم سیستەمە، بە هەمان ئەو ئەندازەیەی لێوەردەگریت، تۆ دەبێت هەوڵ بدەیت تاوەكو ئەنجامی جێگە مەبەستی خۆت وەدەست بێنیت.

یاسای جوڵو جمان: ئەگەر بە وردی سەرنجی سروشت بدەین دەتوانین ئەوە بەدی بكەین كە وانەیەكی شاراوەو پەنهانی تێدایە، ئەوەش ئەمەیە بە هەمان ئەو شێوەیەی كە بۆ ناشتنی درەختێك دەبێت زیاتر لە تۆوێك لە خاكدا بچێنیت، ئێمەش بە هەمان شێوە بۆ سەركەوتن لە كاروبارەكانماندا دەبێت ڕێگە گەلێكی زۆر تاقیبكەینەوە.

هەر لەبەر ئەمە ئەگەر بەڕاستی دەتەوێت كارێك ئەنجام بدەیت، ئەوە باشتر وایە كە زیاد لە جارێك هەوڵبدەیتو كۆشش بكەیت.

لە ڕاستیدا مرۆڤە سەركەوتووەكان لە كەسانی دیكە زیاتر دووچاری شكستو تێكشكان دەبنەوە، هەڵبەتە لەگەڵ ئەم جیاوازییەی كە ئەوان زیاد تۆو نەمامێك دادەكەنو دادەچێنن، لە ڕاستیدا دەبێت تۆوەكە دابكەیتو بجوڵێیتو ئەوجا چاوەڕوانی بەرهەمو بەرووبووم بكەیت. بەڵام هەندێجار ئێمە ئەم یاسایانە لە بیر دەكەینو فەرامۆشیان دەكەینو زۆر خێرا ماندوو دەبین. هەمیشە ئەمەتان لە بیر بێت كە یەكەمجار دەبێت هەوڵو كۆشش بكەیتو ئەوجا چاوەڕوانی سەركەوتن بیت.

سەركەوتنی پلەبەندیو لەسەرخۆ:

هەندێجار بیر لەوە دەكەینەوە كە هیچ شانسێكمان بۆ سەركەوتنو گەیشتن بەوەی دەمانەوێت لەبەردەمدا نییە، وادابنێ دەتەوێت كاروكاسبییەكی باشت هەبێت، بەڵام لە ئێستادا تەنها ئەو كارەی كە بۆت پێشنیار كراوەو لە بەردەستەو هەیە بریتییە لە «ئۆتۆمبیل شۆردن»، پرسیار لە خۆت دەكەیت، ئایا ئەو كارە قبووڵ بكەیت؟ ئەگەر ئەم كارە تەنها كارێكە كە دەتوانیت ئەنجامی بدەیت، بێگومان دەبێت كارێكیش ئەنجام بدەیت، دەی كەواتە كارەكە قبووڵ بكە.

ئەگەر هیچ هەڵبژاردەیەكی گونجاو لە بەردەستدا نییە، ئەوا لە كارێكی بچوكەوە دەست پێبكەو پێی ڕازی بە، بەڵام تەواوی هەوڵو كۆششت لەسەر ئەو كارە چڕو كۆبكەرەوە بەردەوامیش لە بیری پێشكەوتنو دیتنەوەی پێگەیەكی باشتردا بە. دڵنیا بە لەوەی كە ئەگەر كارەكەت بە باشی ئەنجام بدەیت ئەوا دەبیتە كەسێك كە سەرنجی كەسانی دیكە بە لای خۆتدا ڕادەكێشیتو زۆر خێرایانە كارێكی زۆر باشترت بۆ پێشنیار دەكرێت. لە ڕاستیدا سەركەوتن بە شێوەیەكی ئاسایی بە پلەبەندیو هەنگاو بە هەنگاو بە دیدێت. بەو مەرجەی كە سەبرو حەوسەڵە وەخەرج بدەیتو ماندوو نەبیت.

گۆڕانكاری لەسەرخۆو هەنگاو بە هەنگاو:

ئایا ئەگەر بەیانییەك لە خەو بێدار بوویتەوە هەر لە خۆتەوە كتوپڕ ببینیت كە ٢٠ كیلۆ كێشت زیادی كردووە، ئایا نیگەران نابیتو دووچاری شۆك نابیت؟ بێگومان نیگەران دەبیتو خێراو دەستبەجێ سەبارەت بە دابەزینی كێشت بڕیارێكی جدی دەدەیت. بەڵام كاتێك ئەم ڕووداوە لەسەرخۆو وردە وردە ڕوودەدات «ئەم مانگە یەك كیلۆو مانگی داهاتوو دوو كیلۆ... «ئەوا زۆر بە ئاسانیو ئاسایی تێی دەپەڕێنیتو تا دواجار دەبینیت كە ٢٠ كیلۆ كێشت زیادی كردووە.

زۆربەی مەسەلەكان وردە وردە لەسەریەك كۆدەبنەوەو كەڵەكە دەبنو دواجار كێشەیەكی گەورە دروست دەكەن. هەر لەبەر ئەمە دەبێت هەموو ڕۆژێك لە خۆمان بپرسین «من بۆ كوێ دەڕۆم؟ ئایا لە ڕابردووم شادترو سەركەوتووترم؟ «ئەگەر وەڵامەكە نێگەتیڤانەیە، دەبێت چاوێك بە شێوەی ژیانماندا بخشێنینەوەو پێداچوونەوەیەك بكەین.

و/ ئەمانی تەحسین

# ئایا تۆ گەشبینی، یان ڕەشبین؟

ئایا هەورەکان دەبینی، یان ئەوەی کە باران هەڵدەگرێت؟

ڕوانین بۆ داهاتوو بە ڕەشبینی بووەتە شتێکی باو لەم ڕۆژانەدا زیاتر لە ڕۆژانی پێشوو، ئەگەر میلی کاتژمێرمان بگەڕاندایەتەوە بۆ چەند ساتێك پێش ئێستا ئەوا دەتوانین بڵێین ڕێژەی مرۆڤە گەشبینەکان زیاترە لە ڕێژەی ڕەشبینەکان، بە پێچەوانەوە لەم ساتەدا ڕێژەی ڕەشبینەکان زیاترە لە گەشبینەکان...

هۆی ئەم ڕەشبینییە دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزووی ڕەشبینەکان لە بیرکردنەوە لە ڕەشبینییان ئەمە لە لایەکەوە، دەیگوازنەوە بۆ خەڵکانی دەوروبەریان لە لایەکی ترەوە، ئەو هەموو کارەساتو کێشەو بەربەستانەی بەسەر خەڵکانو کۆمەڵگاکان دەگوزەرێت.

ئەو ساتانەی کە بە (ساتە خۆشەکان) دەناسرێن، دەبینین زۆربەی خەڵك بە جۆرێك پێدەکەنن وەك ئەوەی هیچ گرفتێکیان نەبێت، بەڵام لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت هەر مرۆڤێك لە ناخیدا گەشبینیو ڕەشبینی هەیەو خۆی دەتوانێت کۆنترۆڵی خۆی بکاتو دوورکەوێتەوە لە ڕەشبینی!

ئەمەش بە ئاشکرا دەردەکەوێت کاتێك زۆربەمان هەواڵێکی ناخۆش دەبیستین ئەوا ڕەشبینی دامانده‌گرێت، یاخود دەمانەوێت کارێك ئەنجام بدەین کۆمەڵێك بەربەستو ناخۆشی دێتە ڕێمان، ورەمان دەڕوخێو وا لە خۆمان دەکەین کە ئیتر ژیان تەواو.. بەڵام بە پێچەوانەوە کاتێك هەواڵێکی خۆش دەکەوێتە بەر گوێمان، ئەوا گەشبین دەبین بەرامبەر ئایندەمان.

لەم تاقیکردنەوەیە بۆت دەردەکەوێت تا چ ڕادەیەك گەشبینی؟ ئەگەر ئەنجامێکی باشت دەست نەکەوت ئەوا کاتی ئەوە هاتووە گۆڕانکاری بەسەر خۆتدا بکەیتو هەوڵ بدەیت هەمیشە گەشبینو دەم بەخەندە بیت، وتراوە (تفاولوا بالخیر تجدوە) دە خێراکەو خۆت تاقیکەرەوە.

١- پێش ئەوەی لە چێشتخانە بچیتە دەرەوە لە پسوولەی خواردنەکەت ورد دەبیتەوەو دڵنیا دەبیت لە حسابەکەت؟

٢- زۆر بە کەمی لەگەڵ بێگانەدا گفتوگۆ دەکەیت؟

٣- کاتێك لەگەڵ بەڕێوەبەرو سەرپەرشتیارەکەتدا دەبیت لە کارەکەتدا هەست بە ترس دەکەیت؟

٤- هەست دەکەیت ئەو پەیوەندییە ناخۆشانەی پێیدا تێپەڕیوویت کەسایەتی باشتری پێ بەخشیوویت؟

٥- تا ئێستا ڕوینەداوە کەسێك تۆمەتبارت بکات، یان توندبێت بەرامبەرت؟

٦- هاوڕێکانت بە ڕێژەیەك تووشی دڵتەنگی بوون؟

٧- گرەو لەسەر هیچ شتێك دەکەیت؟

٨- ڕووینەداوە لە وادەی فڕۆکەکەت دوا بکەویت؟

٩- پێت باشترە دەست بە کاری ئێستاتەوە بگریت، نەوەك کارێك بکەیت

که لێــی دڵنیا نەبی و بشــزانی لە ٢٥٪ی داهاتــت زیــاد دەکات ئەگــەر ئــەو کا رە بکەیت؟

١٠- بــە زۆرێــك لــە تاقیکردنــەوەی ناخۆشــدا تێپەڕیوویــت و کاتێکی زۆریان خایاندووە؟

١١- کاتێك لەگەڵ هاوڕێکانتدایت زیاتر گوێدەگریت نەك قسە؟

ئەنجــام: بــە (بەڵــێ) یــا (نەخێــر) وەڵامــەکان بــدەرەوە، بۆ هــەر وەڵامێکی (بەڵــێ) نمرەیەك بۆ خــۆت دابنێ، ئەگەر ئەنجامەکەت لە نێوان:

- (٠ - ٤) بوو، ئەوا بەڕاستی گەشبینی... چاوەڕێی باشــتر دەکەیت لــە خەڵکو لە ژیان.. هەروەها زۆربەی کاتەکان دەگەیت بەو شتانەی کە مەبەستتە.

- (٥ - ٩) بوو، تۆ لە نێوان گەشبینیو ڕەشبینی دایت، ڕوانینت بۆ ژیان هەمیشە لە گۆڕاندایە بە گوێرەی دەســتکەوتەکان، یان هۆکارە دەرەکیو دەروونییەکان، وەکو (میزاج، یان کەشو هەوا) دەگۆڕێت.

- (١٠ - ١١) بــوو، تۆ لە ڕەشــبینییەوە زۆر نزیکیو بە دەست شکستەوە دەناڵێنیت، چونکە ئەوەی دەتەوێت لە ژیاندا بەدەستی ناهێنیت.

*

ئەگــەر ئەنجامەکــەت لــەم تاقیکردنەوەیەدا کەمبوو، لە هەمان کاتدا خۆت بە گەشــبین دەزانــی، ئەوا خۆت بە خۆشبەخت بزانە.

گەشــبینی فیترەتێکــی مرۆڤە، خوای مەزن پێی بەخشیووین، لە ڕاستیشدا مرۆڤ داوای گەشــبینی دەکاتو هــەوڵ دەدات لە خودی خۆیدا بەرجەستەی بکات. زانایانی دەروونناسی دەڵێن: تۆوی ڕەشبینی دەست پێدەکاو گەشــە دەکات لــە ناخی مرۆڤدا کاتێك کە مرۆڤێك هەســت بــە نەبوونی پێداویســتییەکانی ژیان دەکات، لە کاتێکدا خەڵکانــی تر لەزەت لەوانە وەردەگرنو لە ناویاندا نقووم بوون، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم شــتانە هیچ گرنگییەکیان نییە کە مرۆڤ هەندێجار لەبەر ئەم شتانە ژیانی خۆی تاڵ دەکات.. هۆکارەکانی ڕەشــبینی هەرچەندو چۆنێك بــن بنەماکانــی ئایینەکەمان بە هەموو بوارێکییەوە چارەسەری کردووە.

ئەگەر ڕەشبینی پرسیارێکی زۆر سادە لە خۆت بکــە.. ئایا چی قازانج دەکەم کە خۆم خســتووەتە ئەم گێژاوی ڕەشــبینیو دڵتەنگییە؟!!

هەوڵ بدە بیرو باوەڕت پتەو بکەیتو پەیوەندییت لەگەڵ خوای باڵادەستدا بەهێز بکەیت. سەرچاوە/ مجلة عالم الابداع.

# خواستی شیعر

ئازاد محێدین محەممەد

کــە جەوهــەر نــەمــا، لــەپــەروەردەدا ئامانجی فێربوون، گۆڕا بە تێربوون عەقڵ برســی بــوو، مــەعیدە ترشا مێژووی دووبارە، خۆی نیشــان داوە شیری سابرینیش، بوو بە قەناعەت سێگۆشــەی نوشتــە، مووروو مورەوا مەزارو گڵکۆو مەرقەدی مــردوو وشکــە درەخــتو دارو پــیــرەدار نیــاز زانیــن و نیــاز گــرتنــەوە داوێن گرتنــەوە، بۆ بــەختــو ئیقباڵ بەردی خەت خەتو هێکەی ڕەنگاوڕەنگ نووسینــی ئــایەت، بەخەتــی زۆر جوان ڕووبــەڕوو بڕۆ، بــۆ پــارە دانــان ئەمــانەو هەموو، هــاوشێــوەکانــی کــات نرخــی نەمــا، وێــران بوو شوێن تــامو چێــژ نەمــا، لەمیوەو خوانــا یــاسا زەلــیــلــە، هێــزی بــــڕاوە حــەبو شروبی، مــاوە بەسەرچوو شێــواوە نــەخــشــەی، ئــەندازیــاری جــیــاوازی نــییە، شــاگــردو وەستــا دڵۆپــەی شــەرم و حــەیــا واتــکــا ئــەوەی نــەمدرکاند، با نەی درکێنم خەریکە شیعر، مانای خۆی ون کا

کــاروان بــەجێ مــا، لــە مەعریفەدا عــەقــڵ و مــەعیدە، وا گیــرۆدە بوون پــەردەی ڕواڵــەت، نــەما هەڵکشا نــەك هــەر بــەجێمان، بــەرەو دواوە عوزر لێژی کرد، جێگەی قەباحەت بە ئاگا هاتــۆ، لــە شیــرین خــەوا زینــدو عــەودالــی، کــڵاوی بابــردوو سەراپا جەستــەی، زەلیلی بزمار پــەرداخــی قــاوە، قــڵپکــردنــەوە لە سایەی دارو درەخــتو هــەرزاڵ یا وێنــەی تاوس، بە نەخشی فەرەنگ وەك گوزارشت کــا، لــە بــڕواو ئیمان مــەرجــە پشتاوپشت، بێیتەوە ئامان ئــەگەر لە واقیــع ساتــێ بــڕوانــی هەفتەو مانگو ساڵ، بە خێرایی دێن چاو ئەبڵــەق بــووە، لــە ڕەنگــەکانا نــەخۆش لــە دکــتــۆر، دڵــی ڕەنجاوە زینــدووە لــە تــاو، بــازاڕی مردوو بەکلیلی نەخشــە، نــاکرێ دیــاری کامە خوێندکــارەو کامە مامۆستا نــاگــەڕێــتــەوە، بــە هــەزار ڕجــا نــە وەك لافــاوی، خوێن هەڵبسێنم لەو زەهرەی دەوێ، سوقرات پێی خنکا

# شەوەکانی منو خەونەکانی باوکم

هەریەکە لەم شەوانە خەمێکی کچۆڵەکەتە...

ببورە بابە گیان: زۆر خۆشم دەوێیت، حەزم دەکرد پێش ئەوەی هەواڵم ببیستن هەواڵم لای تۆبوایە... ئێواران پێش خوان سڵاوت بکردایە... چاوەڕێی ئێمە لەسەر خوان جوانترو ناوازەتر بکردایە.

ببورە بابە گیان.. حەزم دەکرد پێش دانانی ئەرکو ماندوویی ئەو ڕۆژە لە چەند عەلاگەیەکدا.. بزەیەك لە لێوت بوایە، ئێواران چاوەڕێی سۆنگەی ژوانی تۆم بکردایە... شەوان پێش ئەوەی هەواڵی تی.ڤی یەکانت تەماشا بکردایە... هەواڵو سۆراغی کیژۆڵەکەت لابوایە.. لە بری هەموو میوەو چەرەساتێك، گوێم لە گشت وتوێژەکانی تۆ بووایە.

حەزم دەکرد لە بری توانجەکانتو شکاندنی نێو خواستو ئارەزووەکانمان ناوی جوانت ئاڕاستە بکردینایە.

وەك نوێژ دەکەیت جارجارە.. هاوشێوەی پێشەواکەم لە نێو ئاپۆڕای دانیشتنی هاوڕێیانت ناوچەوانی کیژۆڵەکەت ماچ بکردایە.

ببورە بابەگیان حەزم دەکرد پێش ئەوەی خۆت بخەیتە ژێر بالیفەکەتەوە... چاوێکی سۆزت لە کچۆڵەکەت بووایە.

حەزم دەکرد بە بۆنەی تۆوە لە هەموو هاوڕەگەزەکانت بگەیشتمایە.. هێندە خۆشەویستیت بەتین بووایە لە گەڵ دایکم.. منیش لە تۆوە ئاشنایی فێربوومایە.. بۆ هاوڕەگەزەکانت... براکەشم هاووێنەی تۆیە.. هاوسەر.. هاوڕێ.. مامۆستا.. ببورە بابەگیان حەزم دەکرد لە بری ترس... ڕێزم بگرتیتایەو... لە بری شەرم... خۆشم بویستیتایە.

ببورە بابەگیان: کە تۆ خاوەنی باوکداری تەنها بایەلۆجی و کۆمەڵایەتین... حەزم دەکرد هاوشێوەی کچەکانی پێشەوا شوعەیب.. لە هەنگاوەکانی من بگەیشتیتایە... لە سنورەکان فریای من بکەوتیتایە.... لە ترسەکان منت بوێر بکردایە.. تەنانەت لە هەڵبڕینی پێڵوی چاوەکانم بگەیشتیتایە.

ببورە بابەگیان: حەزم دەکرد هەموو شوناسی منت بناسیایە.. هاوشێوەی ڕابەرەکەم لە نێو ئاپۆڕای جەنگدا... ملوانکەکەم بناسیایەتەوە.. حەزم دەکرد کراسەکەم.. سەرپۆشەکەم.. گوارەکەم.... تەنها خۆم.. ببورە بابەگیان دەیانناسیتەوە.. یان بانگەوازی بۆدەکەیت ئاخۆ هی کێیە؟

حەزم دەکرد ئەمشەو تەنها هەرخۆم نەبوومایە.. لە نێو خەونەکانی تۆشدا گوزەرم بکردایە.. لە بری ئێستا من کەوا لەم درەنگە شەوەدا بە ئاگام.. تۆش پرخەت دێ... بدەی لە دەرگای ژوورە تەڕوساردەکەم بە دڵێکی پڕحەسرەتەوە خۆت بکردایە بە ژووردا.. هەستم بکردایە کە چەند بە تاسەوە بیرکردووەتەوە ئاخۆ نووستوم، یان چەند شەوە بە ئاگام.. وەرە دام پۆشە.. فرمێسکەکانم بسڕە.. بیرت دەکەم.. هەرچەند یەك دیوارمان نێوانە.

ببورە بابەگیان، هەرکەس گوێی لەم حەسرەتە بێت وادەزانێ (ئەمە خەیاڵە؟ بەڵام ڕاستەقینەیەو خەیاڵ نییە)، چەندساڵە دنیات جێ هێشتووە، ئەمەی دەیڵێم نازی بێ باوکییە! ببورە بابەگیان.. حەزم دەکرد بەم شەوە درەنگە هەستایت.. تەماشای نوزەی گلۆپی ژوورەکەمت بکردایە.. کێ نالێ.. بەدەم شەوەکانی تری تۆوە کۆتاییم بە هەموو شتێك نەهێناوە.

ببورە بابە گیان: حەزم دەکرد لە بری ئەو هەموو توڕەبوونو هاوارکردنە.. کە لە

کۆڵان.. ناوەکانی خۆمان دەدۆزمەوە... گوێم لە قاقای پێکەنینی یەکتر بووایە، ببورە بابەگیان.. حەزم دەکرد جارێك بێیت بە شوێنما بۆ قوتابخانە.. دەست بخەیتە سەرشانمو ماوەیەك پێکەوە بڕۆشتینایە.. تابلۆیەکمان دروست بکردایە کە ئاشنایی هەموو ڕەنگەکان بووایە.. تۆ باوکێکی دڵسۆز، منیش ئەو کچە نازدارەی بابە بوومایە، چاوەکانم تەنها تۆی بدیایە.

ببورە بابە گیان: حەزم دەکرد بەیانیان کە هەڵدەستی بۆ نوێژ.. تکایە لە دەرگای ژووری منیش بدە، هەرچەندە من هێشتا ڕۆژەو کاتی نووستنم نەهاتووە! یان حەزم دەکرد لە نزاو پاڕانەوە باشەکانت بە ئاگا بهاتمایە..

ببورە بابە گیان واخۆت گۆڕیو چوویت بۆ شوێنی کارت.. نەخەوی ئەم شەوەت بە من سپارد.. نە ڕۆڵێکی ئەمڕۆشت بە من دا.. حەزم دەکرد منیش هاوڕێت بوومایە.. هەندێجار گوێم لێیە هاوڕێکانت بە قسە خۆشەکانت هێندە پێدەکەنن.. دەڵێن ئەوەی لەگەڵ تۆبێ هەرگیز پیر نابێ.. ئەی بابە گیان کیژۆڵەکەت بۆ سەری سپی بوو.. بۆ چرچەکانی ناوچەوانی دەرکەوتووە.. هەمیشە دەستەکانی دەلەرزێ.. تکایە بابە گیان بە هاوڕێکانت قبوڵم بکە.. حەز دەکەم هەمیشە گەنج بم.

ببورە بابە گیان :حەزم دەکرد جارجارە کە لە ڕێی کارەکەت کچۆڵەکەت بەدی بکردایە.. وەکو کەسێکی نەناسراو سڵاوت لێ نەکردایە.. دەست بگوشیمایەو تێرتێر ماچت بکردمایە... هەموو ئەو ڕەنگانەی بە کراسەکەتەوەیە منیشی ڕەنگ بکردایە.. بۆنی ماندووبوونو عارەقتم بکردایە.. چەند پێویستم پێتە بابە گیان ،حەزم دەکرد ئێستا لە بری لە سەرمێزێکی باخچەیەك... خەریکی بە تاڵکردنەوەی شووشەیت... گوێت لە من بووایەو هەموو ئەم خەمانەت بە تاڵ بکردایەوە.. لە بری خەمی لە دەستچوونی بڕێك ماددە، هۆن هۆن مژ لە جگەرەکەت دەدەیتو لە تاو دووکەڵی ڕەش.. ڕووی سپی من نابینی، حەزم دەکرد پێکەوە خەمت لە شەوی من بووایە.. منیش وەکو جگەرەکەی دەستت سوتام.. بەڵام ناتوانیت جارێکی تر دام گیرسێنیتەوە.. هەستم پێ بکە پێویستم پێتە.... ببورە بابەگیان زۆرم پێویست پێتە.. لە نێو کەشتییەکدام.. نازانم شەپۆلەکان بەرەو کوێم دەبات.. سەوڵی کەشتییەکەش نوستووەو کچۆڵەکەت وا بە تەنها بەڕێ دەکەوێت... بابە گیان نەلە خەونەکان دەگەم نەشەوەکانم هەروا سپی دەبێتەوە..

ببورە بابەگیان... دەستەکانت ماچ دەکەم.. ناوت هاتووە بە چوارەم جار لە قوتابخانەکەی پێشەواکەم، (أمك. أمك. أمك. ثم أبوك)... خۆشم دەوێیت... ئەی بابە گیان.

ببورە بابە گیان: حەزم دەکرد هێندە ئاشنا بوویتایە لە گەڵم.. لە بۆنەو جەژنەکاندا.. لە خۆشیو ئاوازی خێزانەکاندا.. یەکەم کەس بوویتایە.. لە هەر کوێ بوومایە.. لە خەیاڵمدا بوویتایە.. هێندە تامەزرۆت بوومایە.. لە هیچ شوێنێك خۆشترم نەدیایە.. هاوشێوەی مامۆستاکەم لە سەرەمەرگدا.. بانگ بکردمایەو چرپەیەك بە گوێمدا بکردایە.. هەرچی خەمی ئەو حەسرەتە پڕ فرمێسکەیە.. بتکردایە بە بزەیەك لە ماڵئاوایت دا... حەزم دەکرد لە جێی هەموو ئەم شەوانە لە ڕێی هەموو ئەم چیرۆکانە... لە سەفەری هەموو ئەم خۆشییانە.. منیش لەگەڵ تۆ بوومایە..

ببورە بابە گیان حەزم دەکرد زۆر خۆشحاڵ بوویتایە ..نەك وشەیەکی زبر زۆر بڵێیتەوە.... بۆ کێی بکەم؟... ببورە بە پرسیارەکەتدا زۆر غەریبین پێت.. بابە گیان ببورە.. خۆشم دەوێیت..هەرچییەك بم.. لە دوای ناوی خۆمەوە.. نازناوی تۆیە.. ببورە بابە گیان... حەددم نییە گەردنت لە لای من بێت.. بەڵام بۆ سەبوری دڵم دەڵێم بابە گیان گەردنت ئازابێت.. زۆر پێویستم پێتە.. قوربانی دەستەکانت بمو هەنگاوەکانت بەرزو پیرۆزن لام، خۆشم دەوێیت.

ببورە بابە گیان: دنیا هێندە کاڵ بووەتەوە.. شەوو ڕۆژێ تەنها دوو سێ کاتژمێر یەکتر دەبینین.. تەنها خەونم حەزم نەکرد چیرۆکەکە سەرەتاکەی ئاوابێ.. بابەگیان.. حەزم لە دەنگتە.. حەزم لە بینینی ڕووخسارتە.. حەزم لە هاوڕێیەتیتە.. حەزم لە ڕۆیشتنو خەونو ئاواتە.. بیرت دەکەم غەریبیت دەکەم.. بابە گیان ببورە.. بە خۆشت نەزانیوە کە چەند پاڵەوانی دراماکەی ژیانمیت.. من چی لە باڵە خانە بکەم.. چی لە گەشتوسەیرانی شاران بکەم.. چی لە گیرفانی پڕو جلی زۆرو ماڵی پۆشتەو سفرەی پڕ لە خوان بکەم.. چی لە ژووری پڕ لە عەنتیکەو زینە بکەم.. من پێوێستم بە تۆیە.. بەم هەموو حەسرەتەوە ئامادەنیم بابەگیان ترسم لە دەستچوونی تۆ هەبێت... بیبەخشم بە یەکێ لە هاوڕەگەزەکانت لە نێو کۆڵانەکان.. بە پێچاوپێچی شەقامەکان.. بە زەنگی مۆبایلەکان.. بە باڵەخانەی شارێیەکان.. تکایە لێم تێبگە.. من هەستاومو هەنگاوەکانم بڕیوە.. تەنها پێویستم بە لە ئامێزگرتنتە..

بابە گیان ببورە گەر هەناسەیەکم مابێ حەز دەکەم پڕ بە دڵ.. لە ئامێزی تۆدا بم.. دەترسم بەرگەی ئەو ڕۆژە نەگرم... چاوەڕێم تەنها تۆ خەمەکانم بزانیتو لە نێو ئاپۆڕای خەڵکدا مژدەی گرەوی ژیانم پێ بدەیتەوە..

ببورە بابەگیان لە کەمتەرخەمی کیژۆڵەکەت.. ناوەکەت هێندە بە خاوەنو گشتگیرە.. هەرکەس خاوەنی منداڵ بێت (کچ، یان کوڕ)، هەر بانگت دەکەن بابە گیان.. لە قوتابخانە، لە زانکۆ، لە دادگا، لە مزگەوت، لە نەخۆشخانە، لە نێو شەقامو کۆڵانەکان.. لە بازاڕو باڵەخانەکان.. لە شاییو خۆشیو ناخۆشییەکانی دەوروبەر لە شەوو ڕۆژدا.. بە منداڵیمو بە گەنجیمو بە پیریم... هەر دەڵێم بابە.. بابە.. بابە.. بەڵام منداڵەکان بۆخۆیان ناوەکانیان جیاوازە.. هەریەکە بە یەك خاوەن بانگی دەکەن.. ناوەکە ناوی کیژۆڵەکەتە.. خاوەنەکەش تەنها تۆی بابە گیان.

# بەرەو باشتر..

زاهیر زانا

ژیان بێ گەشەو بەرەو پێشچوونو بەرهەم، یەکسانە بە نەبوون، داری بەردار شیرینەو داری بێبەریش بەشی بڕینە، مرۆڤیش بە سروشتی خۆی هەمیشە ویستی ژیانی باشترو گوفتاری باشترو باشتر کردنی تێدایەو ئەم ویستە وای لێ دەکات هەمیشە بیر لەوە بکاتەوە ئایندەی لە ئێستای ڕۆشنتر بێتو بتوانێت سبەی لە ئەمڕۆی ڕووناکتر بێتو بەرهەمی زیاترو باشتری هەبێت، تا بە خۆیو خەڵکی کەڵکی زیاتر بدات، ژیانی باشتر پێویستی بە بەکارهێنانی بیرو هزری زیاترو ڕێكو پێكو خستنەگەڕی تواناکانە.

بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار دەبێت بەرەو باشتر بڕۆین، چونکە خەزێنەی ئەزموونەکانمان زیادی کردووەو تێگەیشتنمان کامڵتر بووە، با هەمیشە لە لوتکەیەکەوە بڕۆین بەرەو لوتکەیەکی بەرزتر، تا هەمیشە ڕۆحمان شاد بکەین بە دیمەنی نوێو جوانترو هەناسەی کامەرانی قوڵتر هەڵبمژین، بە زیادکردنی بە دەستهێنانە باشەکانمانو باشترکردنی باشەکانمان تا متمانەی دەروونیمان زیاد بکاتو هەست بکەین بوونمان پێویستەو خۆمان لە دونیادا زیادەنین، هەروەك ڕافیعی دەڵێت: (ئەگەر شتێکت لەسەر دونیادا زیاد نەکرد، ئەوا خۆت لەسەر دونیادا زیادەیت).

ئێمەی مرۆڤ لە سایەی نیعمەتی ژیریو بیرکردنەوەوە دەتوانین هەمیشە بەرەو باشتر هەنگاو بنێین، بۆ ئەمەش ئەم چوار بنەمایە دەخەینە ڕوو:

١- خۆت بناسەو بزانە تۆ کێیتو خاڵە بەهێزو لاوازەکانی کەسایەتی خۆت بناسەو هەوڵی چارەسەرکردنی خاڵە لاوازەکانو بەردەوامبوونو پتەوکردنو پەرەدان بە لایەنە بەهێزەکانی کەسایەتی خۆت بدەو لە هەڵەو کەموکوڕییەکانی ڕابردووت سودو کەڵكو پەند وەربگرە.

٢- با ئامانجت ڕوونو ئاشکرا بێتو بزانە هەوڵ بۆ چ شتێك دەدەیتو بۆ هەوڵی بۆ دەدەیت؟ چونکە ئەگەر نەزانیت هەوڵ بۆچی دەدەیت هەرگیز ناکرێت پێی بگەیت، هیچ شتێکیش لە خۆوەو بە ڕێکەوت ڕوونادات، ئامانجەکەت بە وردی دیاری بکەو لە تەواوی لایەنەکانی شارەزایی پەیدا بکەو ئاگاداربە با واقیعیو گونجاو و بە سوود بێتو حەزو خولیاکانی تۆی تیا کۆببێتەوەو بیریشت بێت ڕێگەی گەیشتن بە ئامانج پێویستی بە ماندوبوونو هەوڵو تێکۆشانە.

٣- نەخشە بکێشە بۆ گەیشتن بە ئامانجو ئاراستەکردنی ڕێڕەوی ژیانی خۆت بەرەو ئەوەی دەتەوێت پێی بگەیتو تەواوی ڕێگاکانی گەیشتن بە ئامانجەکەت بزانەو ئاسانترینو گونجاوترینو شیاوترینیان هەڵبژێرە، سوود لە ئەزموونی ئەو کەسانە وەربگرە کە پێش تۆ بۆ ئەو ئامانجە ڕۆیشتونو تەواوی ئەو تواناو لێهاتوییانەت بەکار بهێنە کە خوای گەورە پێی بەخشیویت، ئاگاداربە چی نەخشەیەك دەگریتە بەر بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەت، چونکە

(if you fell to plan you plan to fell) واتە: (ئەگەر شکستت هێنا لە نەخشەدانانەکەتدا ئەوا نەخشەت کێشاوە بۆ شکست)، خۆت، خۆت بە دروستی ئاڕاستە بکە، نەك بارودۆخەکان ئاڕاستەت بکەنو هەرکاتەو بۆ ئامانجێك هەوڵبدەیتو هەر جارەی نەخشەو ڕێگایەك بگریتە بەرو پاش کەمێك ماندوبوون بگەڕێیتەوەو پاشگەز ببیتەوە، بۆیە پشوو درێژو بە ئارام بە.

٤- هەمیشە چاودێری ڕێڕەوی ژیانت بکەو بە خۆتدا بچۆرەوەو ئاگاداری نەخشەو پلانەکانت بەو بزانە تائێستا چەندت لێ جێبەجێکردووەو چەندێك لە ئامانجەکەت نزیك بوویتەوە، کەموکوڕییەکان چارەسەر بکەو بۆ ئەو ئاستەنگانەی دێنە ڕێت، چارەسەری گونجاو دابنێو هەرگیز کۆسپو لەمپەرەکان کۆڵت پێ نەدەنو لە ئامانجەکەت دوورت نەخەنەوە.

هیوادارم هەموو ڕۆژێکی نوێی ژیانمان کارێکی نوێو نایابی تێدا ئەنجام بدەینو باشتر بیربکەینەوەو باشتر بڵێینو باشتر ئەنجام بدەینو هەموو ساتو کاتو ڕۆژێکی ژیانمان بەرەو باشتر بڕۆین، چونکە پێغەمبەر( درودی خوای لەسەر بێت)، دەفەرموێت: هەر کەسێك ڕۆژەکانی ژیانی یاخود دوو ڕۆژی وەك یەك بێت ئەوە زیانی کردووە.

# کلاوکوڕەو فیلی زەبەلاح

ئا/ چیا عەبدوڵڵا

کلاوکوڕەیەك هێلانەیەك لەسەر ڕێگەی فیلێکدا دروست دەکاتو لەسەر چەند هێلکەیەك کڕ دەکەوێت، هەموو جارێك فیلەکە بۆ ئاوخواردنەوە لە وێوە تێدەپەڕێت، ڕۆژێك کە کلاوکوڕە لەوێ نەبوو فیلی زەبەلاح بەسەر هێلکەکاندا ڕۆیشتو هێلکەکانی پانکردەوەو بەچکەکانیشی کوشت، کاتێك کلاوکوڕەکە هاتەوەو چاوی بەم حاڵە کەوت زۆر خەمبار بوو، دڵنیابوو لەوەی کە ئەمە کاری فیلەکەیە، کلاوکوڕە فڕی تا گەیشتە لای فیلەکەو بەسەر سەریەوە نیشتەوە، بە گریانەوە وتی: ئەی پادشای گەورە بۆچی ئاوات لە هێلکەکانم کردووە؟ بۆچی بەچکەکانت کوشتووم؟ خۆ من دراوسێی ئێوە بووم، ئایا لەبەر بچووکیو کەمهێزی من بوو ئەوەتان کرد؟

فیلەکە بە فیزێکەوە وەڵامی دایەوەو وتی: بەڵێ لەبەرئەوەبوو..

کلاوکوڕەکە زیاتر دڵتەنگ بوو، لەبەرئەوە چووە لای کۆمەڵێك باڵندەو سکاڵای خۆی لا کردن، ئەوانیش وتیان: ئێمە باڵندەیەکی کەم تواناو بێهێزو بێ دەسەڵات و هەژارین، خۆت دەزانی بەرامبەر زەبەلاحێکی وەکو فیل شتێکمان لە دەست نایەت!!

پاشان کلاوکوڕەکە بەردەوام بوو لە هەوڵدان بۆ تۆڵە کردنەوەی بەچکەکانی، چونکە دەیزانی لووتبەرزیو ستەمکاری فیلی زەبەلاح هەر ڕۆژێك بێت دەستی ستەمکاری دەگاتە کلاوکوڕەی دایكو هاو شێوەکانی، هەر بۆیە چووە لای قەلە ڕەشو پێی وت: من شتێکی وام لێ بە سەرهاتووە ئایا هاوکاریم دەکەیت بچی بە دەنووك هەر دووچاوی هەلکۆڵین؟ ئەگەر هاوکاریم بکەیت، پێکەوە پلانێکی بۆ دادەنێینو دەتوانین نەهێڵین دەستی ستەمکارانەی بگاتە بێ تواناو کەم دەسەڵاتەکان، کلاوکوڕە لەگەڵ قەلەڕەش لەسەر ئەم خاڵە پێکهاتن، هەر دووکیان بە پێی پلانێکی تۆکمە چوونە سەر سەری فیلی زەبەلاحو بە دەنوکیان چاوەکانیان کوێر کرد... ئیدی فیلەکە نەیدەتوانی بچێتە سەر ڕووبارەکە ڕێگای ئاوخواردنەوەی نەدۆزییەوە...

دوای ئەوەش کلاوکوڕەکە کۆڵی نەدا، بەڵکو چوو بۆ لای بۆقەکانو سکاڵای حاڵی خۆی بۆ کردن، بۆقەکانیش وتیان: ئێمە گیاندارێکی بچووكو بێ دەسەڵاتین، چیمان پێ دەکرێت بەرامبەر گیاندارێکی زەبەلاحی وەکو فیل؟ وتی: گەر هاوکاریم بکەن پلانێکم دارشتووە بە هاوکاری ئێوە دەتوانین فیلی زەبەلاحو ستەمکار لە ناوبەرین!

ئەوانیش بەڵێنی هاوکارییان دا، کلاوکوڕەکە پێی وتن: ئێوە بچنە ئەو چاڵەی نزیك دارستانو دەست بە قیڕە قیڕ بکەن، دەنگی ئێوە بەڵگەیە لەسەر هەبوونی ئاو لەو شوێنەدا، بەرەو ڕووی دەنگەکە دێو دەکەوێتە چاڵەکەوە، بۆقەکان چوونە نزیك چاڵەکەو دەستیان بە قیڕە قیڕ کرد، فیلەکەش لە کاتێکدا تینوویەتی هەراسانی کردبوو، بەرەو دەنگە ڕۆیشت بە نیازی ئاوخواردنەوە، بەڵام لە ناکاو کەوتە نێو چاڵەکەوەو هەرچی کرد نەیتوانی خۆی ڕزگار بکات!

کلاوکوڕەکەش چووە سەرسەریو پێی وت: ئەی زۆردار عەیامێك بوو ستەمت لە گیاندارانی بێدەسەڵاتو هەژاری دارستان دەکرد، بە باسكو بازوو گەورەیی خۆتت دەنازی، لە خۆت بایی بوویت، بە چاوی سووك سەیری منو باڵندەو گیاندارانت دەکرد، ئێستا بڕوانە سەرەڕای بچووکیو کەم دەسەڵاتیم چیم بە تۆی زۆردار کرد؟!

ئەم چیرۆکە لە ڕووی دەروونییەوە: کلاوکوڕەکە تۆی مرۆڤیت، هێلکەکان، هیواو ئاواتەکانتە، فیلی زەبەلاح، ئەو کێشەو ڕێگرانەن کە تۆ لێیان دەترسیت بێنە ڕێگەی هاتنە دی هیواو ئاواتەکانت.

کاتێك ئەم ڕێگرییە ڕووبەڕووت دەبێتەوە وای دەبینی ئاواتەکانت لە ناوبردووە، ئیتر هیوایەکت بۆ ژیان نییە، لە کاتێکدا سوپاس بۆ خودا ئێستە ڕێگەی فێربوونو زانست زۆرە، دەتوانیت بە هۆی فێربوونو گەڕان بە دوای زانستو زانیاری دا بەسەر تەواوی کێشەکانو کۆسپو لەمپەرەکانی ژیاندا سەرکەوتوو بیت، کەواتە بەربەستو ڕێگرییەکان تەنها پێویستیان بە پلانی ڕووبەڕووبوونەوە هەیە لە ڕێگەی گەڕان بە دوای زانستو زانیاری دا، بەم کارەشت بە تەواوی بەسەر فیلی زەبەلاحدا زاڵ دەبیت.

سەرچاوە/ بە سود وەرگرتن لە چیرۆکێکی کلیلەو دیمنە.

# ١٢ شێواز بۆ زاڵبوون بەسەر تەممەڵی‌و سستی‌و ئەنجامدانی کاری زیاتر لە کاتی کەمتردا

ئا: کامیار عومەر

١- سـفرەکەتان پـان ڕابخـەن: بـە وردی بزانـن چیتـان دەوێـت، زانینـی ڕوون‌و ئاشـکرای ئـەو بابەتە، زۆر گرنگە پێـش ئەوەی دەسـت بە کاربـن، ئامانج‌و بڕیارەکانتان بنووسن.

٢- بـۆ هەر ڕۆژێك، پێشـتر بەرنامە دارێژن: لەسـەر کاغەز بیربکەنەوە، هەر خولەکێك کە بۆ بەرنامە داڕشتن تایبەتی دەکـەن، پێنج تـا دە خولـەك کاتتان بۆ دەگێڕێتەوە.

٣- ڕێسای ٨٠ بە ٢٠، لە گشت کارەکاندا بە کار بێنن: بە لە ٢٠٪ی چالاکییەکانتان، لـە ٨٠٪ی دەرەنجامەکانتـان بە دی دێنن. کەوابێ هەمیشە هەوڵ‌و تێکۆشانتان لەسەر ئەم ٢٠ لە سەدە جێگیر بکەن.

٤- دواپێشهات‌و دەرەنجامی کارەکان لە بەرچاو بگرن: گرنگترین کارەکانی ئێوە ئەو کارانەن کە دەتوانن پێشـهات‌و دەرەنجامی نێگەتیف، یان پۆزەتیف لە ژیان‌و کارتاندا بـە دوای خۆیاندا بێنن. هێز‌و تواناکانتان لەسەر ئەوانە کۆبکەنەوە.

٥- بەردەوام سوود لە شێوازی (ئەلف بێ) وەربگرن: پێش ئەوەی بەپێی پێڕستی کارەکانتان دەسـت پێ بکـەن، لە چەند چرکەیەکـدا نـرخ‌و بایەخی هـەر کام لە کارەکانتـان دیـاری بکەن، تـا گرنگترین کاری بەردەمتان ئاشکرا بێت.

٦- بیـر لـە ئامانجـە بنەڕەتییەکان بکەنەوە: ئەو ئاکامانەی بۆ گەیشـتن بە ئامانجە بنەڕەتییەکان دەبێت پێیان بگەن، دیـاری بکەن‌و پاشـان لە تـەواوی ماوەی ڕۆژدا کاریان لەسەر بکەن.

٧- پەیـڕەوی لە یاسـای دیاریکردنی پێویسـتییەکان بکەن: بۆ جێبەجێکردنی هەمووو کارەکان هەرگیـز کاتی تەواوتان نییـە، بەڵام بـۆ ئەنجامدانـی گرنگترین کارەکان هەمیشـەدەرفەتی پێویسـتتان هەیە، ئەو کارە گرنگانە کامانەن؟

٨- پێـش دەسـتپێکردنی هەرکارێـك هەل‌ومەرجی پێویستی بۆ بڕەخسێنن: خۆ سازکردن لەپێشدا، پێش بە لاوازبوونی کار دەگرێت.

٩- توانـا تایبەتییەکانـی خۆتـان بەهێزتـر بکەن: بە وردی دیاری بکەن لە چ کارێکدا باشـن‌و لـە چ کارێکدا دەتوانن باشـبن، بە تەواوی هەوڵی جێبەجێکردنی بدەن.

١٠- لەمپـەرە گرنگەکانـی بەردەمتان دیاری بکەن: ئەو بەربەست‌و لەمپەرانەی خێرایی گەیشـتنی ئێوە بە ئامانجەکانتان کەم دەکەنەوە دیـاری بکەن‌و هەوڵ بدەن لە ناویان بەرن.

١١- لە شـێوازی تەممەڵـی داهێنەرانە کەڵك وەربگرن: لەبەرئـەوەی کە ناتوانن گشـت کارەکانتان جێبەجـێ بکەن دەبێت فێربن کە ئەو کارانەی بایەخی کەمتریان هەیـە بـۆ دواتریـان هەڵبگـرن، تـا بۆ ئەنجامدانی کارە گرنگەکان کاتی زیاترتان لە بەر دەستدا بێت.

١٢- سـەرەتا دژوارترین کار جێبەجێ بکـەن: هەمـوو ڕۆژێکتان بـە دژوارترین کار دەسـت پێ بکەن، بە کارێك دەست پێ بکەن کە زۆرترین کاریگەری لەسـەر کار‌و ژیانتاندا هەبێت. کاتێك کارێکتان دەسـت پێکـرد، دەبێ تـا کاتی تـەواو بوونی لە سەری سوور بن.

## ڕاهێنانی مێشك

**بە وردی لەم وێنەیە ورد بەرەوەو**
**هێزی مێشكو بیركردنەوەت بخەرەكار**
**بزانە چی دەبینیت؟ تا چ ڕادەیەك دیدی تێڕوانینت وردە؟**

خێزانی بەختەوەر

پەری شێخ کەریم

# چۆن هاوسەرەکان لە یەکتری تێ دەگەن؟

بۆچی زۆرێك لە خێزانەکان ڕووبەڕووی لێکترازان دەبنەوە؟

ئایا چ هۆکارێك وایکردووە زمانی گفتوگۆ لە نێو هاوسەراندا نەمێنێت؟

ئایا هەردوولا چی لە یەکتری داوادەکەن؟

جیاوازی نێوان ئەم دوو بوونەوەرە وایکردووە زۆرجار تێگەیشتنو بیروبۆچوونیان جیاواز بێت، دروستبوونی کێشەو ناکۆکییەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتن لە یەکتری، هەردوولا هەست بە نەمانی هەستوسۆزی خۆشەویستی یەکتر دەکەن، بێگومان بەردەوام پێشبینی هەڵە دەبێتە بێ هیوایيو نائاسوودەیی.

بە پێویستم زانی لەم ژمارەیەدا چەند نهێنییەك باس بکەم کە بووەتە هۆکاری تێنەگەیشتنی هەردوولا ئەم نهێنییەش لە بوونییەتی ئافرەتو پیاودا هەیە پێویستە لێیان شارەزابین:

نهێنی یەکەم: پیاو حەزدەکات خۆی بسەلمێنێت بەو شتانەی کە بەرهەمی دێنێت، بەڵام ئافرەت حەز دەکات خۆی بسەلمێنێت بە پشت بەستن بە هاوسەرەکەی لە ڕێگای دەرخستنی هەستو سۆزەوە.

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی دروستبوونیان هەریەکەیان خوای گەورە بە شێوەیەك دروستی کردوون کە تایبەتمەندیو سیفەتی تایبەتی پێبەخشیوون، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە ئەصلی (ئادەم) (سەلامی خوای لێبێت) لە خۆڵ دروستکراوە، بەڵام حەوا لە ئادەم دروستکراوە، واتە حەوا هاوبەشە لە سیفەتی مرۆڤ، پاشان سیفەتی خۆڵ، زۆرجار پیاو ناودەبرێت بە دڵڕەقو وشك، چونکە ئەصلی لە خۆڵە، بوونیەتیان وایکردووە کە بەو شێوەیە بن.

خوای گەورە لایەنی هەستوسۆزی زیاتر بەخشیوە بە ئافرەت تا بۆ ماوەی نۆ مانگ توانای هەڵگرتنی منداڵی لە سکیدا هەبێت، پاشان بە خێوکردنو لاواندنەوەی، بەڵام چونکە بنەڕەتی پیاو لە خۆڵەو بنەڕەتی خۆڵیش لە زەوییە، هێمای زەویش بەرهەمهێنانو کارکردنە، پیاویش تەنها بە کارکردن ئاسوودە دەبێتو حەز بە گەڕانو کارکردن دەکات، بۆیە زۆرجار سەرزەنشتی پیاوان دەکرێت بە کەم ئامادەبوونیان لە ماڵەوە، یا کاتێك دەگەڕێنەوە بەخێرایی لە ماڵەوە بێزار دەبن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بنەڕەتی دروستبوونیان.

ئەم نهێنییە ئەوە دەردەخات زۆرجار پیاوان لە دەربڕینی هەستو سۆزدا وەك ئافرەت نین، ئەم هۆکارە بووەتە مایەی کێشەو ناکۆکی لە نێو خێزانەکاندا کە لە نهێنییەکانی تردا زیاتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە.

نهێنی دووەم: پیاوان لە دەرخستنی بیروبۆچووندا بەشی لای چەپی مێشکیان بەکار دەهێنن، بەڵام ئافرەتان بەشی لای ڕاستی مێشکیان بە کاردەهێنن، ئەمەش نهێنییەکی زۆر گرنگە، پیاوان زیاتر

لێکدانـــەوەو بیرکردنـــەوەو پێشـــکەوتنو بەرنامەڕێژییـــان لـــە لا دروســـت دەبێت، بەڵام ئافرەتان بەشـــی ڕاســـتی مێشـــکیان بـــە کاردەهێنـــن کـــە خۆشەویســـتیو بیرکردنەوەیە!

ئەوەی لێـــرەدا مەبەســـتمانە ئەوەیە هەنـــدێ ســـیفەتیان هاوشـــێوەن، بـــەڵام شـــێوازی دەربڕینەکانیـــان جیـــاوازە، بـــۆ نموونـــە کاتێـــك پیـــاو ســـەرقاڵ بێت بە کارێکەوە تەنها دەتوانێت بیری لەسەر ئەو کارە بێت، ناتوانێت ســـەرقاڵبێت بە قســـە کردنـــەوە، یا بە کارێکی تـــرەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە دەبینیـــن ئافرەتێك خەریکی چێشـــت لێنانەو لە هەمان کاتدا دەتوانێت ســـەیری تەلەفزیـــۆن بکاتو قســـەش بە تەلەفۆن بـــکات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بەشی بیرکردنەوە لە لای ئافرەتان زیاترە، لە لێکۆڵینەوەیەکدا دەرکەوتووە کە ئەقڵی پیاو سندوقییە، بەڵام ئافرەت شەبەکییە، لـــە کۆمەڵـــێ بـــەش بـــەش پێکهاتـــووە، ئافرەتیـــش بە هەمـــان شـــێوە دەتوانێت خەیاڵـــی لەســـەر کۆمەڵێ کاربێـــت، وەك ئـــەو نموونەی ســـەرەوە باســـمان کرد، بۆ نموونە ئەقڵی هەر شـــتێك کە ســـندووقی هەبێـــت بە شـــەکانی پارێـــزراوەو تێکەڵ بەشتی تر نابێت، ئەم نهێنییەش ئەوەمان بـــۆ دەردەخات کـــە پیاوان لـــە دەربڕینی هەستوسۆزو خۆشەویستیدا وەك ئافرەت نین، چونکە ئافرەت لە ئەنجامدانی هەموو کارێکدا حەز بە دەربڕینی خۆشەویســـتی دەکات، ئەمەش کێشەیەکە کە ڕووبەڕووی خێزانـــەکان دەبێتـــەوە کـــە پیـــاوان کەم دەتوانن هەستو سۆزیان دەرببڕن ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بوونییەتی پیاوان، چونکە وەك باســـمان کرد ئافرەت لێپرســـراوێتی ماڵو بەخێوکردنی منداڵی پێبەخشـــراوە، بێگومـــان ئەم کارەش بێ هەســـتو ســـۆز ئەنجام نادرێت!

نهێنـــی ســـێیەم: پیـــاو ســـەیری کارەکان دەکات بەشـــێوەیەکی گشـــتی، بـــەڵام ئافرەت حـــەز بەلێکدانـــەوەی ورد دەکات. بۆ نموونە: کاتێك باســـی ڕووداوێك، یـــا کارێك دەکرێت، پیاو بەشێوەیەکی گشتی سەیری دەکات، بەڵام ئافـــرەت حەز بە ڕوونکردنـــەوەو لێکدانەوەی ئـــەو کارە دەکات، بـــۆ زیاتـــر تێگەشـــتن لەم نهێنییە حەزدەکەم باســـی ئەم ڕووداوە بکەم کـــە کێشـــەی چەندەهـــا خێزانە: ماسۆســـتا (جاســـم مطوع ) کە پســـپۆرە لـــە پەروەردەی خێزانـــدا دەڵێت: ڕۆژێك چووم بۆ دادگا لەوێ دوانزە کێشـــەی خێزانی خراپە بەر دەســـتم، یەکێـــك لەو کێشـــانە ئەوەبوو کـــە ئافرەتێك نارەزایـــی هەبـــوو لـــە هاوســـەرەکەی بەوەی کەمتەرخـــەمو بێهەســـتو ســـۆزە بەرامبەری کاتێـــك دەیبینێـــت نازانێـــت خۆشەویســـتیو سوپاســـکردن دەربڕێت، داوای جیابوونەوەی دەکرد، منیش بۆ چارەســـەرکردنی کێشـــەکە بانگی هاوســـەرەکەیم کرد، پـــاش وتوێژکردن لەسەر کێشـــەکە هاوســـەرەکەی ڕاوبۆچوونی ئەوەبـــوو وتـــی: مامۆســـتای بەڕێـــز من زۆر توانـــاو ئـــارەزووی ئـــەوەم نییە بـــۆ نموونە: کاتێك چێشـــتێك لێدەنێت لێی بپرســـم چۆن لێتانـــاوە؟ یـــا چ کات لێتنـــاوە؟ کـــەی تەواو بوویـــت... هتد؟! خێزانیشـــم حەز دەکات بۆ دەستخۆشیکردنی لە هەموو کارەکانی ماڵەوەی بـــە وردی بکۆڵمـــەوە، منیش بـــۆم دەرکەوت زۆربەی کێشـــەی خێزانـــەکان ئەوەیە دەڵێن: هاوســـەرەکەمان نرخی کارەکانمـــان نازانێت، بـــەڵام بـــە پێچەوانەوە بواری فســـیۆلۆجییان وایکردووە بە شـــێوەیەکی گشـــتی تەماشـــای شتەکان بکەن.

نهێنـــی چـــوارەم: جیاوازی لاشـــەییو ئەندامەکانی پیاو لەگەڵ ئافرەتدا، ئەمەش هۆکارێکە بۆ تێگەیشتنی هەردوولا بەوەی هەندێ کار کە لـــە توانای پیاودا هەیە لە توانـــای ئافرەتـــدا نییەو بـــە پێچەوانەوە، زۆرجـــار کێشـــە دروســـت دەبێت لـــە نێو خێزانەکاندا، بە هۆی بیرنەکردنەوەیان لەم جیاوازییە، بۆ نموونە: پیاو زیاتر شارەزایی لـــە کاروبـــاری دەرەوەدا هەیـــە ناتوانێت وەك ئافرەت خەریکی چێشـــتلێنانو ماڵو منـــداڵ بێتو بە پێچەوانـــەوەش هەندێ کاری دەرەوە هەیـــە کە لە توانای ئافرەتدا نییـــە، ئەمـــەش نابێـــت ببێتـــە هۆکارێك بۆ ســـەر زەنشـــتکردنو بێتوانایـــی، بەڵکو بوونیەتـــی هەریەکەیان جیاوازەو گونجاوە بە پێـــی ئەندامەکانی، بەڵام ئەگەر کارێك لـــە توانـــای یەکێکیانـــدا نەبوو پێویســـتە هاوکاری یەکتری بکەنو ئەم کارەش زیاتر پەیوەنـــدی خێزانی بەهێز دەکاتو دەبێتە مایـــەی خۆشەویســـتی، خۆ ئەگـــەر نەکرا نابێتە مایەی سەرزەنشتکردنی یەکتری.

دوا وتـــەم ئەوەیە ئایا هەردوولا داوای چی لە یەکتری دەکەن؟

هـــەردوولا زۆر پێوســـتیان بـــە خۆشەویستیو دڵســـۆزیو وەفاداری هەیە، ئەنجامدانـــی هەمـــوو کارێك لەســـەر ئەم بنەمایانـــە دەکرێت، با ڕێز لـــە کارەکانی یەکتـــر بگریـــن، بابیـــر لەجیاوازییـــە فسیۆلۆجییەکانمان بکەینەوەو سەرزەنشتی یەکتری نەکەینو یەکتر بە کەمتەرخەمو نەفام نەزانین!!

با زمانی گفتۆگۆمان بە تێگەیشتنەوە بدوێتو ڕاســـتییەکان بـــۆ یەکتری ڕوون بکەینەوە.

## ژیان فێری کردم!

ژیـــان فێـــری کـــردم: کاتێك مـــرۆڤ ژیانـــی خاڵی دەبێت لە شکســـت، کەواتە وەکو پێویست هەوڵی نەداوە.

ژیـــان فێری کردم: کەســـانێك هەن زۆر ئاســـتەمە بتوانیت ڕازییـــان بکەیت، ئەگـــەر (١٠٠٠) مـــۆم دابگیرســـێنێت، پێت دەڵێن: ئەی کوا مۆمی ژمارە (١٠٠١) هەزارو یەك، خـــۆ ئەگـــەر (١٠٠٠٠٠٠) یەك ملیۆن مۆم دابگیرسێنیت، پێت دەڵێن: کوا مۆمی ژمارە (١٠٠٠٠٠١) یەك ملیۆنو یەك... هتد.

ژیان فێری کردم: باشترین ڕێگە بۆ فێربوون، بریتییە لە فێرکردن.

ژیان فێری کردم: هەرگیز ناتوانیت قەناعـــەت بـــە هەمـــوو خەڵکـــی بکەیت، هەرچەندە کەسێکی بە ئەزموونیش بیت.

ژیـــان فێری کردم: هیـــچ مرۆڤێك کامـــڵ و تـــەواو نییـــە، لە پێـــش هەموو کەسەوە منو تۆ!

ژیان فێری کـــردم: مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت بە بێ خەڵکی ژیان بگوزەرێنێت، هەرچەندە کەسێکی سەرکەوتووش بێت.

ژیان فێری کردم: سەرکەوتن (١٠٠٠) هاوەڵو هاوبەشـــی هەیە، هەر کات مرۆڤ لە کارەکانیدا سەرکەوتنی بە دەست هێنا، زۆرێك لە خەڵکی بۆ لای دەگەڕێنەوەو لە دەوری کۆدەبنەوە، بەڵام گەر هەمان مرۆڤ شکستی هێنا، ئەوا هەموو ئەو کەسانە لێی دووردەکەونەوەو سەرزەنشتی دەکەن.

ژیان فێـــری کردم: کـــە زۆرێك لە خەڵکی ڕۆژانە نێو ماڵو نووسینگەکانیان پاك دەکەنەوە، بەڵام کەمێك لەوان عەقڵو بیرۆکە خراپەکانیان پاك دەکەنەوە!

# وەرزەکانی خۆشەویستیی ژیانی هاوسەرێتی

و: گۆران حسن

خۆشەویستی وەکو باخچەیەك وایە، ئەگەر بمانەوێت ئەو باخچەیە هەمیشەسەوزو ڕازاوەو جوان بێت، پێویستە بە بەردەوامی گرنگی پێ بدەینو چاودێری بکەین، ئاوی بدەین، خاکەکەی چاك بکەینو بە پیتی بکەینو تۆوی تێدا بچێنین. ناوبەناو باخچەکە پاك بکەینەوەو بژاری بکەینو لق و پۆپە زیادەکان ببڕین. دەبێت چاودێری هەموو بەشەکانی بکەین.

خۆشەویستی هاوسەریش بە هەمان شێوەیە، پێویستە لە هەموو وەرزو گۆڕانە جیاوازەکانی تێبگەینو پاشانیش چاودێری بکەین. خۆشەویستیش وەك وەرزەکانی ساڵ چوار وەرزی هەیە:

## ١- وەرزی بەهار:

خۆشترین وەرزە، لەم وەرزەدا کەسی گونجاو دەستنیشان دەکرێت، دەکەوینە ناو خۆشەویستیو بەو هەستە مەزنە بەهرەمەند دەبین. لەم وەرزەدا هەست بە بەختەوەری هەتا هەتایی دەکەین، ناکرێت بیربکەینەوە تەنانەت بیهێنینە بەرچاومان کە دوور لەو کەسە بژین کە خۆشمان دەوێت، ئەوە کاتی خۆشەویستیو پاکییە، لەم وەرزەدا مرۆڤ هەست دەکات کە ئەو خۆشەویستییە ئەزەلییەو کۆتایی هاتنی نییە، ئەو ساتەوەختە جوانی سەرسوڕهێنەری خۆی هەیە کە کاروبارەکان لە باشترین بارودۆخدا دەبن، تێروتەواوی لە هەموو شتێکدایە.

لەم وەرزەدا هەست بە هەڵەی یەکتر ناکەینو نایبینین، هەموو ئەوەی ئەنجامی دەدەین گەورەیەو کاریگەری مەزنی هەیە لەسەر خۆمانو هەستەکانمان، خۆشبەختی هەتاهەتاییە.

بەڵام ئەمە ڕاستییەکە نییە، هەردەبێت وەرزی داهاتوو بێت، ئەویش وەرزی هاوینە!

## ٢- وەرزی هاوین:

ئەم وەرزە جیاوازە لە وەرزی بەهار، لەم کاتەدا مرۆڤ هەست دەکات خۆشەویستەکەی لە پلەی تێرو تەواویدا نییە وەك پێشتر گومانی دەبرد، دەست دەکات بە تێبینی کردنی هەڵەکان لە هەڵسوکەوتو ڕووخسارو کەسایەتی لایەنی بەرامبەردا، ئەو هەڵانەی لە پلەی کاملیو تێرو تەواوییەوە دەیخاتە پلەیەکی خوارتر. مرۆڤ دەستدەکات بە هەستکردن بەوەی خۆشەویستەکەی پەری نییە، بەڵکو وەکو کەسانی تر ئەویش مرۆڤەو کەموکوڕی هەیە. بەڵکو هەندێجار مەسەلەکە دەگاتە ڕادەی بیرکردنەوە، لەوەی کە ئەو کەسە سەر بەجیهانێکی ترەو جیاوازە لە جیهانی ئەو، لێرەدا هەڵسوکەوتی تازە سەرهەڵدەدات، هەڵسوکەوتی وا کە دەبێتە هۆی بێزاریو دەمار گرژیو نائومێدیو سەرهەڵدانی کێشە.

لەم وەرزەدا پێویستە لەسەر پیاوو ئافرەت کە بە دڵسۆزی کاربکەن بۆ چاککردنەوەی هەڵەکانو هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیاندا، هەروەکو گژوگیای ناو باخچە، ئەو گژوگیایەی پێویستە لاببرێت، گرنگیدان بە دارودەوەنی تر کە خەریکە وشك دەبن و دەمرنو پێویستیان بە ئاودانو چاودێریکردن هەیە.

لەم وەرزەدا پێشکەشکردنی خۆشەویستیو وەرگرتنی بەو شێوەیە ئاسان نییە کە لە وەرزی پێشوودا هەبوو واتە وەرزی بەهار. لێرەدا هەردوو لایەن دەگەنە ئەو بڕوایەی کە ئەو خۆشبەختییەی کە لێی بەهرەمەندن ئەزەلی نییەو بوارێکی فراوان هەیە بۆ خەمباری.

لەم وەرزەدا زۆربەی ژنومێردەکان تووشی لێڵ بینی دەبنو باوەڕ بەوە ناکەن کە ڕوودەدات، بەڕاستی شۆکێکی گەورەیە، چونکە ئەوان لە سەرەتاوە پێشبینی ئەوەیان دەکرد لە بەهارێکی بەردەوامدا بن، بەڵام لە ناکاو تووشی واقعێکی تاڵ بوون. ئەو واقیعەی کە دەڵێت ژیان بەو شێوەیە ئاسان نییەو پڕە لە کێشەو گرفت.

پاش ئەوەی کێشەکان دەستپێدەکات، هەر لایەك هەوڵدەدات سەرزەنشتەکە بخاتە ئەستۆی لایەنەکەی تر.

نازانن کە خۆشەویستی پێویستی بە هەوڵو کۆششێکی زۆرو بەخشندەییەکی زۆر هەیە بۆ بەدەستهێنانیو هێشتنەوەی بەو ڕەونەقەی کە هەیەتی.

لەم وەرزەدا مرۆڤ پێویستی بە تێرکردنی پێویستییەکانی لایەنەکەی تر هەیە، هەروەها پێویستی بە داواکردنو دەستکەوتنی ئەو خۆشەویستییە هەیە کە پێویستییەتی. لە ڕاستیدا بەختەوەریو خۆشەویستی لە خۆوە نایەن، بەڵکو ئەوە پێویستی بە هەوڵو کۆششی زۆری هەردوولایەن هەیە، پیاوو ئافرەت.

## ٣- وەرزی پایز:

پاش ئەو هەموو کۆششو هەوڵەی کە هەردوولایەن لەوەرزی هاویندا داویانە، وەرزی پایز دێت، وەرزی بەرووبوم، بەڵێ وەرزی بەروبوم، پاش ئەوەی هەردوولایەن لە هەڵوێستەکانی نێوانیان تێگەیشتنو هەوڵو کۆششێکی زۆریان بەخەرجدا بۆ چاککردنو زاڵبوون بەسەر ئەو هەڵوێستانەدا، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بە خۆشیو ئاسوودەیی ژیان بەسەر بەرن.

وەرزی پایز کاتی قبوڵکردنی ژنو پیاوە بۆ یەکتری، وەك ئەوەی کە هەن بە واتایەکی تر قبوڵکردنی لایەنی باشیو خراپی یەکترو تێگەیشتنە لە یەکتری، ئەوە کاتی خۆشەویستیو ئاسوودەییە.

### ٤- وەرزی زستان:

خۆزگــە وەرزی پایز بەردەوام بوایە، یان لانی کەم درێژەی بکێشایە، بەڵام پێویست بوو ئەو وەرزە بڕۆیشتایەو بواری بۆ هاتنی وەرزی زســتان بکردایەتــەوە. هەردەبوو کەشوهەوا بگۆڕایەو وەرزی زستان بهاتایە کە پلەی گەرما تێیدا نزمەو ســەرما سەختەو گەڵای دارەکان دەوەرنو خەریکــە ژیانیــان تێــدا نامێنێت. ئــەوە وەرزی چونەوەیــەكو نوێبوونەوەیە، ئــەو وەرزەیە کە تێیدا پەیوەندی ژنو مێرد بە قۆناغی ساردو سڕیدا دەڕوات. ئەو کاتەیە کە ئەزمونە پارێزراوەکانی ڕابردووی نەستی تێــدا دەردەکەوێتو نێگەتیڤانــە کاردەکاتە ســەر هەڵســوکەوتەکانمان. ئــەو وەرزەیــە کــە تێیــدا پیاو ئــازار دەچێژێــتو بڕیاری پاشەکشەو گۆشەگیری دەداتو پاشان دەچێتە ئەو ئەشــکەوتەی تەنها جێگای یەك کەســی تێــدا دەبێتەوە. ئەو کاتەیە کە تێیدا ئافرەت دەروونــی ڕووخــاوەو دەمــاری گــرژە. ئەو وەرزەیە ژیان تێیدا ســەختەو کێشەی زۆری تێدایەو هەموو ڕێگاکانــی پەیوەندیی نێوان ژنو پیاو وەستاوە.

هەروەهــا ئــەو وەرزەیــە کــە پێش جوانترینو خۆشترین وەرز دەکەوێت، کە وەرزی بەهارە.

بێگومان پــاش هەموو ناخۆشــییەك خۆشــی دێت، پــاش هەمــوو تاریکییەك ڕووناکی دێت.

ئەمە سروشتی ژیانەو پێویستە قبوڵی بکەیــنو بەخۆشــیو ناخۆشــیەکانییەوە لەگەڵیدا بژین، ئەوە ڕاســتییەو پێویستە بــەو شــێوەیەی خــۆی قبوڵــی بکەیــن. پێویستە خۆمان نەخەڵەتێنینو وانەزانین کــە تێرو تەواوی (کمــال) لە ژیاندا هەیە، هەردەبێت هەندێك کات خۆشیو هەندێك کاتی تر ناخۆشی بێت. بەڵێ ئەمە ژیانەو پێویســتە لێی تێبگەینو قبوڵــی بکەین. گرنــگ ئەوەیە ئــەوە بزانینو لە یەکتری تێبگەین هەروەها لە جیاوازییە سروشتیو دەروونییەکانمان تێبگەین.

پێویســتە یەکترمــان خۆشــبووێتو لێبوردەبین، هــەوڵ نەدەین لە حوکم دانمان لەگەڵ یەکتری ستەمکار بین، پێویستە پێش حوکمدانمان لەســەر هەرشتێك لێکۆڵینەوەی لەبــارەوە بکەین. پێویســتە ئەگــەری هەڵە تێگەیشــتن لە لایــەن خۆمانــەوە لەبەرچاو بگریــن. بەڵێ ئێمە مرۆڤیــنو هەندێجار بە هەڵە تێدەگەین، مرۆڤیش مرۆڤەو هەندێجار دەیپێکێــتو هەندێجاریــش هەڵــە دەکات، دەبــا هــەوڵ بدەین لــە یەکتــری تێبگەین، هەروەها بوار فراوان بکەین بۆ ئەگەری هەڵە تێگەیشتنو لە یەکتری ببورینو هەوڵ بدەین بەشێوەیەکی باشتر ژیان بەسەربەرین.

## هەوڵدانێکی بە سوود

و: درەخشان بەهادین محەممەد

پیرەمێردێکــی ئەمریکی موســوڵمان لەگەڵ نــەوە بچکۆلانەکەیدا لە کێڵگەیەك لە چیاکانــی ڕۆژهەڵاتــی کەنتاکی دەژیا، هەموو ڕۆژێــك بە یانیــان بابەگەورە لە پشت مێزێك دادەنیشتو قورئانی دەخوێند، نەوەکەشــی هەمــوو جارێــك لەگەڵیــدا دادەنیشتو هەوڵی دەدا وەك باپیری بکات، ڕۆژێك کوڕە بچکۆلەکە پرسی: (بابەگەورە من هەوڵ دەدەم وەکو تۆ قورئان بخوێنم، بەڵام لێــی تێ ناگەم، شــتێك کە لێی تێ نەگــەم، زوو لە بیرم دەچێــتو کتێبەکە دادەخەم، کەواتە خوێندنی قورئان بۆ من چ سوودێکی هەیە؟).

بابەگــەورە بە ئارامــی خەڵووزی نێو سەبەتەکەی خستە نێو سۆپاکەوە، وەڵامی دایەوە: ئەو سەبەتەی خەڵووزە بگرەو بڕۆ لە ڕووبارەکە سەبەتەیەك ئاو بهێنە.

نەوەکــەی وتی: بــەڵام بەرلەوەی من بگەمەماڵەوە تەواوی ئاوەکە لە سەبەتەکە دەڕژێت! بابەگــەورە پێکەنیو گوتی: ئەو کات تۆ ناچار دەبیت دواتر کە چوویت ئاو بهێنیت کەمێك خێراتر بگەڕێیتەوە.

منداڵەکــە ســەبەتەکەی هەڵگــرتو ڕۆیشــت بۆ ڕووبارەکە، بۆئــەوەی هەوڵی خۆی بدات، ئاوی کردە ســەبەتەکەوەو بە خێرایــی ڕای کرد، بەڵام پێش گەیشــتنی ســەبەتەکە بەتاڵ بوو، لە کاتێکدا هەناسە بڕکێــی پــێ کەوتبوو بە باپیــرەی گوت: هەڵگرتنــی ئــاو لــە ســەبەتەدا مەحاڵە، ڕۆیشــت ســەتڵێکی هێنا، بابەگەورە وتی: من سەتڵێك ئاوم ناوێت، سەبەتەیەك ئاوم دەوێت، تۆ بە ئەندازەی پێویســت هەوڵت نەدا.

منداڵەکە لەگــەڵ ئەوەی دەیزانی ئەو کارە مەحاڵە، بەڵام ویستی بە بابەگەورەی نیشــان بدات ئەگەر خێراتریــش ڕابکات دیسان بەرلەوەی بگاتە ماڵەوە هیچ ئاو لە ســەبەتەکەدا نامێنێت، بابەگەورەش هاتە دەرەوە تا هەوڵی دووبارە کردنەوەی سەیر بکات، کوڕەکە دیسان سەبەتەکەی لە ئاوی ڕووبارەکــە پڕ کردو بە خێرایی ڕای کرد، بەڵام کاتێــك گەیشــتەوە لای بابەگەورە، دیسان سەبەتەکەی بە تاڵ بوو!

بە هەناســە ســواری وتی: بابەگەورە ســەیرکە، بێســوودە، بابەگــەورەی وتی: دیســان وابیــر دەکەیتــەوە کە ئــەم کارە بێسوودە؟!

سەیرێکی ســەبەتەکە بکە، کوڕەکەش ســەیری کرد ســەبەتەکە گۆڕاوە، سەبەتە پیــسو چڵکنەکــە ئێســتا ســەبەتەیەکی خاوێنە.

بابەگــەورە وتــی: کــوڕم کاتێــك تۆ قورئان دەخوێنیت لەوانەیە لە شــتێك تێ نەگەیت، یا لە بیری بکەیت، بەڵام کاتێك بەردەوام دەبیت، بە تێپەڕبوونی کات ناخو ڕووخســارت دەگۆڕێتو لە ژەنگو پیســی پاکی دەکاتەوە!

سەرچاوە/ گۆڤاری (موفقیت).

# بۆچی ناخوێنینەوە

ن: كريم الشاذلی
و: محەممەد عەولا مێرگەیی

بێگومان خوێندنەوە پێویستی بە ماندووبوونو تێکۆشانیکی زۆر هەیە، ڕاستە خوێندنەوە زۆر جۆری هەیە وەك خوێندنەوە بۆ چێژ وەرگرتن وەکو خوێندنەوەی ڕۆمانو چیرۆکو پەرتووکی بچووك، مەبەست لە خوێندنەوە تەنها چێژ وەرگرتن نییە، هەرچەندە چێژ وەرگرتن لە خوێندنەوە ئامانجێکی زۆر بەهادار وپیرۆزە، بەڵام خوێندنەوەی بەرهەمدار پێویستی بە جۆرێك لە ئیلتزامو پابەندبوون هەیە، هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ کتێب پێویستی بە پشوو درێژیو پابەندبوونو لە هەمان کاتدا هەستکردن بە بەرپرسیارییەتی بەرامبەر کتێب زۆر پێویستە، بۆیە ئەمەی خوارەوە چەند پابەندبوونو ئیلتزامێکن کە دەبێ لە کاتی خوێندنەوەدا پێیانەوە وابەستە بین:

یەکەم: سەرکەوتن بە سەر گرێی دەروونیدا: ئەو گرێ دەروونییەی وا لە مرۆڤ دەکات کتێبو خوێندنەوە بەلایەوە زۆر قورس بێت، واسەیری خوێندنەوە بکات کە هۆکارێکە بۆ باوێشکدانو خەوبردنەوە، بۆ سەرکەوتن بە سەر ئەم گرێ دەروونییەدا پێویستە خوێنەر خۆی پڕچەك بکات بە چەند شتێك لەوانە نیازپاکیو خۆ یەك لاکردنەوە بۆ خوێندنەوەیەکی زانستیانەو دروستکردنی پاڵنەرو هۆکاری هاندەر بۆ خوێندنەوە، یەك لەو پاڵنەرانە بریتییە لە دروستکردنی خۆشەویستییەك لە نێوان خۆمانو ئەو بابەتەی کە دەیخوێنینەوە، خۆشەویستییەك کە وابکات ڕەنگ بداتەوە لەسەر ئاکارو گوفتارو ئاستی ڕۆشنبیریمانو تێگەیشتنمان لە شتەکانی دەوروبەرمان.

دووەم: پێویستە بزانین کە زانستو زانیاری گەورەترین هۆکارن بۆ نزیکبوونەوەی مرۆڤ لە خودای گەورە، نابێ هیچ کات ئەم خاڵە لە یاد بکەین، لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە خوێنەر وابەستەکەم تەنها بە خوێندنەوەی وانەی شەرعیو ئایینی... بەڵکو هاوکات لەگەڵ ئەوانەشدا هەر کتێبێك یان نووسراوێك کە خێرو بەرژەوەندی مرۆڤایەتی تێدا بێت، ئەوا بێگومان خوێنەر بە خوێندنەوەی پێی نزیك دەبێتەوە لە خوای گەورە، جا چ لە بواری زانستی، یاخود هونەری، یاخود ڕۆشنبیری گشتی بێت.

سێیەم: پلاندانان بۆ خوێندنەوە، دیارە هەر کاتێك مرۆڤ بیەوێ کارێك ئەنجام بدات ئەگەر پشتی بەستبوو بە پلانێك، ئەوا بێگومان سوودو قازانجی کارەکە زۆر زیاتر دەبێت بە بەراوورد لەگەڵ ئەوەی کەوا کارەکە بێ پلان ئەنجام بدات، بێگومان ئەم بۆچوونە هاوتەریبو ڕێکە لەگەڵ فەلسەفەو چەمکی چۆنییەتی خوێندنەوە، جیا لەوەش پلاندانان بۆ خوێندنەوە چەند سوودێکی تایبەتی هەیە کە دەتوانین لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کورتی بکەینەوە:

أ- دابەشکردنی کات بەسەر خوێندنەوەدا.

ب- دروستبوونی سەلیقەو جۆرە ئارەزوویەك کە بتوانین هەڵسەنگاندن بکەین بۆ خوێندنەوەمان.

ج- گرنگیدان بە چۆنیەتی خوێندنەوەوخۆ دوورگرتن لە چەندێتی لە کاتی خوێندنەوەدا.

د- جۆرێك لە ئیلتزامو وابەستەبوون دروست دەبێ بە هۆی ئەو پلانەی کە دامانڕشتووە بۆ خوێندنەوە.

چوارەم: چی دەخوێنینەوە؟ ئەم پرسیارە زۆر گرنگە لە خۆمانی بکەین، پێویستە بەرنامەسازیو ستراتیژیەتێك دابڕێژین بۆ جۆری خوێندنەوەمان، ئەمەشیان دەبێ لەوەوە سەرچاوە بگرێ کە ئایا ئێمە مەیلمان بۆ چ جۆرە خوێندنەوەیەك هەیە، چونکە مەرج نییە خوێنەر هەرچی بکەوێتە بەر دەستی بیخوێنێتەوەو موتاڵای بکاتو خۆی پێوە ماندوو بکات.

پێنجەم: ئارامگرتن لە سەرەتادا، دیارە سەرەتای دەستپێکردنی هەرکارێك ماندوو بوونو هیلاك بوونو ڕاهێنانی زۆری دەوێت، ئەوە نییە مووشەك لە کاتی دەرچوونی چ وزەیەکی زۆری پێویستە، بۆیە سەرەتاکان

هەردەم قورسن، ئەگەر مرۆڤ بیەوێت دەست بە کارێك بکات ئەوەی زیاتریش قورسی دەکات ئەوەیە بەرهەمی کار لە سەرەتادا زۆر کەمو نەدیوو سادەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە بزانین کە بە ئارامگرتنو پشوودرێژی دەتوانین بەری ڕەنجمان زیاد بکەین، بۆیە ئەگەر بمانەوێ خۆمان لەسەر خوێندنەوە ڕابهێنین، پێویستە لە کتێبی بچکۆلەو نامیلکەوە دەست پێبکەین، چونکە ئەم جۆرە کتێبانە کەمتر وردبوونەوەو تێفکرینی دەوێ وەك لە کتیبی گەورە، مەبەستم لەو جۆرە کتێبە بچووکانە وەك ڕۆمانو کتێبی کورتە چیرۆكو دیوانە شیعری بچووكو ئەو کتێبانەی کە لە دووتوێیاندا ژیاننامەی گەورە پیاوانی تێدا کورت کراوەتەو.

شەشەم: با کاتە مردووەکان بقۆزینەوە، لە کۆمەڵگەی ئێمەدا زیاتر بەو کاتانە دەوترێ: (کاتی مردوو)، کاتێ مرۆڤ لە چاوەڕوانیدایە، وەك چاوەڕوانکردنی پاس، یان چاوەڕوانی لە نۆرینگەی پزیشکی، یان چاوەڕوانی لای سەرتاش لەو شوێنانە مرۆڤ نابێ دەستەوسان بێت، بەڵکو پێویستە لانی کەم خۆی سەرقاڵ بکات بە خوێندنەوەی ڕۆژنامەیەك، یاخود گۆڤارێك، دیارە ئەوەی سەردانی ڕۆژئاوای کردبێت دیویەتی کە چۆن ئەو جۆرە شوێنانە چەندە جەنجاڵن بە جۆرەها کتێبو ڕۆژنامەو گۆڤار، بۆیە لەوێ هەر لەگەڵ دەستپێکردنی چاوەڕوانی خۆیان سەرقاڵ دەکەن بە خوێندنەوەی ڕۆژنامە، یان گۆڤار، یان هەر نەبێ بە گوێدانە بابەتێکی دەنگی لە ڕێی بەکارهێنانی MP3.

حەوتەم: باوا لەخوێندنەوە حاڵی بین کەوا ئیلتزامو پابەندبوونە، خوێندنەوە هیوایەت نییە هەرکاتێ بۆشاییەك لە کاتمان هەبێ بخوێنینەوە، ئەگەر ئەو بۆشاییە نەما نەتوانین بخوێنینەوە، بەڵکو خوێندنەوە پێویستی بە ئیلتزامێکی توندوجددی هەیە، بۆیە گەورە خوێنەرانو خوێنەرانی ڕاستەقینە ئامۆژگاریمان دەکەن کە کاتێ دەخوێنینەوە لە هەموو بوارەکاندا ئامادەییمان تێدابێت، چ لە بواری دەروونی، یاخود بواری ژینگەیی، چ لە بواری ئامادەگی زەینیو بیروهۆش بێت، بۆئەوەی ئەو شتەی کە دەیخوێنینەوە زۆرترین سوودمان پێ بگەیەنێ، کەواتە با خەیاڵمان لەگەڵ خوێندنەوە ئالودە بێ، وا باشترە لە کاتی خوێندنەوە قەڵەمێکمان بە دەستەوە بێت بۆئەوەی ئەو شوێنانەی کە پێمان باشە هێڵی بە ژێر دابهێنین، واچاکترە ئەگەر دەستمان دایە کتێبێك وازی لێنەهێنین تاکو تەواو دەبین لە خوێندنەوە.

# نامەی منداڵێك بۆ دایکە میهرەبانەکەی!

ئێوارەبوو، کوڕە بچکۆلانەکەی بۆ لای دایکی بۆ ژووری چێشتلێنان سەرکەوت، لەو کاتەدا دایکی سەرقاڵی ئامادەکردنی خوانی ئێوارە بوو، کوڕە بچکۆلانەکە نامەیەکی دایە دەستی دایکی، چەند داواکارییەکی تێدا نووسرابوو، دایکە میهرەبانەکەی خێرا دەستەکانی خۆی بە بەروانکەکەی وشك کردەوە، دەستی کرد بە خوێندنەوەی نامەکە...

لە نامەکەدا کوڕە بچکۆلانەکەی نووسیبووی:

- کرێی بڕینی چیمەن و گژوگیا (٥) دۆلار.

- کرێی خاوێنکردنەوەی ژوورەکەم لەم هەفتەیەدا (١) دۆلار.

- چاودێرییکردنی برا بچکۆلەکەم لەو کاتەی تۆ دەڕۆیت بۆ کەلوپەل کڕین (٢٥) سەنت.

- لابردن و فڕێدانی زبڵ و پاشماوە (١) دۆلار.

- بۆ بەدەستهێنانی نمرەیەکی باش لە خوێندن (٥) دۆلار.

- خاوێنکردنەوەو کۆکردنەوەی گەڵاو پاشماوەکانی حەوشە (٢) دۆلار.

- ڕۆیشتن بۆ فرۆشگا بۆ کاری تۆ (٥٠) سەنت.

سەرجەمی هەمووی (١٤) دۆلارو (٧٥) سەنت.

دایکە میهرەبانەکەی سەیرێکی کوڕەکەی کرد، کوڕەکە توانی هەموو یادگارییەکانی چاوی دایکی بخوێنێتەوە کە دەدرەوشانەوە لە بیرو هزری دایکیدا، دایکەکە دەستی دایە قەڵەم و پارچەکاغەزەکەی وەرگێڕایەوەو چەند شتێکی تیادا نووسی.

ئەمەش ئەم شتانە بوون کە تیایدا نووسی:

- کرێی ئەو (٩) مانگەی کە تۆم هەڵگرت و لە کاتێکدا تۆ لە ناو سکی مندا گەشەت کرد و گەورەبووی (هیچ).

- هەموو ئەو شەوانەی لەگەڵ تۆدا هەڵدەستامەوە، چاودێری و نزام بۆ دەکردی (هیچ).

- بۆ هەموو ئەو کاتانەی گریاوم، هەموو ئەو فرمێسکانەم کە تۆ بووی بە هۆی هەڵوەرینیان بە درێژایی ساڵ (هیچ).

- بۆ هەموو ئەو شەوانەی کە پڕبوون لە ترس و ناڕەحەتی، هەموو ئەو دڵەڕاوکێیانەی ڕووبەڕووم دەبوونەوە (هیچ).

کوڕم کاتێك کۆیان دەکەیتەوە، نرخی تێچوونی خۆشەویستیم بۆت (هیچ).

لەو کاتەی کوڕەکە هەموو ئەو نووسینەی خوێندەوە کە دایکی بۆی نوسیبوو، چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك و گوتی: دایەگیان خۆشم دەوێیت، پاشان قەڵەمەکەی وەرگرت و بە چەند پیتێکی گەورە نووسی: دایە گیان کرێکەم بە تەواوەتی وەرگرت.

# دەتەوێت منداڵەکەت دروست پەروەردە بکەیت؟

و: عیرفان یاسین زەڵمی

ئاگاداری ئەم خاڵانەی خوارەوە بە:

- ئەگەر منداڵ لە کەشوهەوایەکی هانداندا ژیا، ئەوا متمانە بە خۆ بوون فێر دەبێت.

- ئەگەر منداڵ لە کەشوهەوایەکی خۆگریدا ژیا، فێری ئارامگرتن دەبێت.

- ئەگەر منداڵ لە کەشوهەوایەکی ستایشکردندا ژیا، فێری خۆشەویستیو ڕازیبوون دەبێت.

- ئەگەر منداڵ لە کەشوهەوایەکی هاوبەشیکردندا ژیا، فێری بەخشینو دەستگیرۆیی دەبێت.

- ئەگەر منداڵ لە کەشوهەوایەکی پاکدا ژیا فێری ڕاستگۆیی دەبێت.

- ئەگەر منداڵ لە کەشوهەوایەکی پاکوبێگەردا ژیا، فێری دادپەروەری دەبێت.

- ئەگەر منداڵ لە کەشوهەوایەکدا ژیا ڕەچاوی هەستەکانی کرا، فێری ڕێزگرتن دەبێت.

- ئەگەر منداڵ لە کەشوهەوایەکی لێپێچینەوەو ڕەخنە گرتندا ژیا، فێری درۆکردن دەبێت.

- ئەگەر منداڵ لە کەشوهەوایەکی کپکردنو توندڕەویدا ژیا، فێری دوژمنایەتیکردن دەبێت.

- ئەگەر منداڵ لە کەشوهەوایەکی ترسنۆکیدا ژیا، فێری لاوازیو دڵەڕاوکێ دەبێت.

- ئەگەر منداڵ لە کەشوهەوایەکی تەبایيو کۆمەڵایەتیدا ژیا، فێری لیپێچینەوە دەبێت.

- ئەگەر منداڵ لە کەشوهەوایەکی گاڵتەپێکردندا ژیا، فێری تەریقبونەوە دەبێت.

- ئەگەر منداڵ لە کەشوهەوایەکی ئیرەیی بردندا ژیا، فێری حەسودی بردن دەبێت.

- ئەگەر منداڵ لە کەشوهەوایەکدا ژیا زیاد لە پێویست گرنگی پێدرا، فێری متمانە بە خۆنەبوون دەبێت.

- بەڵام ئەگەر منداڵەکەت خاوەنی چالاکییەکی زیاد لە سنوری تواناکانی بوو، ئەوا پێویستە پەیڕەوی ئەم ڕێنماییانە بکەیت:

- گاڵتەی پێ مەکەو توند مەبە لەگەڵیدا.

- باوا هەست بکات کە خۆشت دەوێت.

- هەست بکات کە گرنگی پێ دەدەیت.

- هەندێك ئەرك بخەرە ئەستۆی کە سەرکەوتووبێت لە جێبەجێکردنیاندا، پاشان هانی بدە لەسەر سەرکەوتنی لە کارەکانیدا بە بەخششێك کە خۆشی بووێت.

- ڕێی پێبدە بەو شتەی کە خۆشی دەوێت، ئەگەر وازیهێنا لە ڕەفتارێکی نادروست.

- خۆت گێل بکە لەو ڕەفتارەی منداڵەکەت کە بێزارت دەکات.

- چاوەڕوانی لە منداڵەکەت مەکە، پاش ئەوەی خەڵاتت کرد، گوێڕایەڵیت بکات، ئەگەر گوێڕایەڵی کرد خەڵاتەکەت دووبارەبکەرەوە، ئەگەر سەرپێچی کرد خەڵاتەکانت بکێشەرەوە بێ ئەوەی سزای بدەیت، خۆی ئەو بەخشش لێسەندنەوەیە دەبێتە سزا بۆی.

- شێوازی هەڕەشەکردنو سزادان بە کارمەهێنە لەگەڵیدا ئەو شێوازە بگۆڕە بە ئاسانکاری.

- خۆدوور بگرە لە منداڵەکەت لە کاتی توڕەبوونیدا، هیچ قسەیەکی ئاراستە مەکە هەتا هێور دەبێتەوە.

- لە بەرامبەرخەڵکیدا لۆمەی مەکە هەرچەندە منداڵیش بن، یان گەورەبن.

- ڕەفتاری نادروستی فێر مەکە دواتر دوای لێبکەیت وازیلێبهێنێت، چونکە ئەو ڕەفتارە لە لای جێگیر دەبێت، بەڵام ڕەفتاری دروستی فێر بکەو خۆشەویستیان بکە لە لای.

- با هەست بە متمانە بە خۆبوون بکات لەسەر تواناکانی هەرچەندە دیاریکراوبن.

- کارێك مەدە بە سەریدا کە لە سەرو توانای خۆیەوە بێت، دووبارەبوونەوەی ئەو کارە ئەو گرفتانەی هەیەتی گەورەتری دەکاتو گرفتی نوێش دەهێنێتە ئاراوە.

- بەراوردی مەکە لەگەڵ کەسی تردا، بەڵکو بەراوردی لەگەڵ خۆیدا بکە لە کاتێك بۆ کاتێکی تر.

- ئەگەر شتێکی شکاند توڕەیی خۆت مەڕێژە بەسەریدا، بەڵکوو وازی لێبهێنە تا پاشماوەکانی کۆبکاتەوەو هاوکاری بکە لە کۆکردنەوەیدا. پاشان بە هێمنی چۆنییەتی پارێزگاریکردن لەو شتانەی پێ بڵێ.

- لە یەك کاتدا داوای دوو کاری لێ مەکە ئەنجامیان بدات.

- پێی پێ مەکەنە، بەڵکو لەگەڵیدا پێ بکەنە، گاڵتەی پێ مەکە، ئەگەر ڕەفتارێکیشی نواند شیاوی گاڵتەپێکردن بوو.

- ئەگەر بەڵێنت پێدا بە هەر شتێك ڕێز لە بەڵێنەکەت بگرە، یان داوای لێبوردنی لێ بکە.

لە کۆتاییدا...... ئەگەر هەر لۆمەکردنی منداڵەکەت پێویستی کرد لەسەر ڕەفتاری نادروستو خراپ، ئەوا دەستەواژەی ڕەخنەکان ئاراستەی کارەکەی بکە، نەك منداڵەکە خۆی، بۆ نموونە:

بڵێ: ئەو ڕەفتارە هەڵەیە.... مەڵێ: تۆ هەڵەیت.

بڵێ: ئەوە کارێکی خراپە... مەڵێ تۆ خراپی.

بڵێ: ئەو کارە ژیری لە کەدار دەکات، مەڵێ تو بێ عەقڵی.

بڵێ: دەکرێ ئەو کارەو ئەوکارە بکەیت، تۆ لە تواناتدا هەیە.... مەڵێ بۆچی ئەوەو ئەوەت کرد هەڵسوکەوتی خراپت نواند.

لە ئینتەرنێتەوە وەرگیراوە

# وەڵامی بەجێ!

ن/ محەممەد مەلا مەحمود

ئاشکرایە زمان پردی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکانە، هۆکارێکە بۆ دەربڕینی هەستو ناخ، بە هۆیەوە بیروڕا ئاڵوگۆڕ دەکرێت.

لە بە ر ئـە و ە دەبێت هەمووما‌ن بە ورياييەوە بدوێين، تاوەکو ئەوەی دەيڵێين جێگای خۆی بگرێت. تا بە هۆی زمانەوە دووچاری دووبەرەکیو ناکۆکی نەبين، چونکە زۆرجار بە هۆی تاکە وشەيەك، يان وەڵامێکی نابەجێوە ڕووداوی ناهەمـوارو کارەساتی نابەجێ ڕوودەدەن.

بە تايبەت لە کاتی پرسيارکردندا، دەبێت وەڵامەکان بە شێوازێك بێت هەستی بەرامبەر بريندار نەکاتو خوێندنەوەی گوماناوييان بۆ نەکرێت، تاوەکو ئەنجامێکی نادروستی لێنەکەوێتەوە.

ئەمانەی خوارەوە چەند نموونەيەکی بەهێزو بە پێزن، لە وەڵامی ژيرمەندان، بە وەڵامەکانيان ڕاستييان ڕوونکردووەتەوەو کەسانی بەرامبەريشيان بێدەنگو سەرسام کردووە:

١- (ئەصمەعی) يەکێك بووە لە شاعيرە مەزنەکانی سەردەمی خەليفە (هارونە ڕەشيد)، لە گەشتێکيدا ڕێی دەکەوێتە گوندێکی دەشتەکی نشينەوە، ئەو شەوە دەبێتە ميوانی ماڵی يەکێك لە گوندنشينەکان، دەبينێت ئافرەتی ماڵەکە زۆر جوانو ڕێكو پێكو ژيرو ورياو لێهاتووە، بەڵام پياوێکی ناشيرينو نەزان هاوسەرييەتی، (ئەصمەعی) لە ئافرەتەکە دەپرسێت: چۆن ڕازی بوويت ببيتە هاوسەری ئەم پياوە ناشيرينو نەزانە؟

ئافرەتەکەش وەڵامێکی زۆر جوانی دەداتەوەو دەڵێت: ڕەنگە ئەو پياوەی من نێوانی خۆیو خوای گەورەی ڕێكو چاککردبێت، خوای گەورەش هەر لە دنيادا منی کردبێت بە پاداشتی چاکەکەی، يان پێدەچێت من لە نێوان خۆمو خوای گەورەدا خراپەيەکم ئەنجامدابێت، خوداش لە تۆڵەی ئەوەدا ئەم پياوەی بە من ڕەوابينيبێت.

الزواجر: إبن حجر الهيتمی.

٢- جارێکيان (باڵوڵ) لەگەڵ کۆمەڵێك لە دەوڵەمەندانی شاری (بەغداد) پێکەوە دانيشتبوون، يەکێك لە دەوڵەمەندەکان سەيريکرد (باڵوڵ) جلوبەرگەکانی شڕو دڕاوە، بە گاڵتە پێکردنەوە پێی وت: (باڵوڵ) منو تۆ چ جياوازيەکمان هەيە، چ شتێکيشمان لە يەك دەکات؟

(باڵوڵ)يش لە وەڵامدا وتی: مێشکی تۆ وەکو گيرفانی من بەتاڵە، بەڵام مێشکی من وەکو گيرفانی تۆ پڕە!

٣- جارێکيان (شێخ حەسەنی بەصری) ئامادەی بەخاکسپاردنی جەنازەيەك دەبێت، شێخ لە يەکێك لە ئامادەبووان دەپرسێت: بە بڕوای تۆ ئەگەر ئەم مردووە بگەڕێتەوە بۆ دونياو جارێکيتر زيندوو بێتەوە چاکە دەکات، يان خراپە؟

کابراش لە وەڵامدا دەڵێت: بێگومان کاری چاکە دەکات، خۆی لە هەموو خراپەيەك دەپارێزێت.

شێخيش لە وەڵاميدا دەڵێت: وابزانە تۆ ئەو مردووەيت، بەڵام مۆڵەتی ژيانت پێدراوەتەوە!

٤- دەگێڕنەوە خەليفەی مسوڵمانان (عومەری کوڕی عه بد و لعه ز يز ) شەوێکيان لەگەڵ پۆليسەکانی ناوشاردا چووەتە دەرەوە، بۆ ئەوەی بزانێت خەڵكو دانيشتووانی شار ژيانو گوزەرانيان چۆنە. لە درێژەی سە ر د ا نە کە يد ا سەردانی ناو مزگەوتی کرد، لە کاتی ڕۆيشتندا لەبەر تاريکی پێی لە کابرايەك هەڵکەوت کە خەوتبوو، کابرا خەبەری بووەوە، زۆر بە توڕەييەوە وتی: ئەوە تۆ کوێريت؟

خەليفەش وتی: نەخێر!

بەرپرسی پۆليسەکان ويستی سزای بدات، بەڵام خەليفە ڕێگەی نەداو وتی: نەکەی ئازاری بدەيت، ئەو هيچی نەکردووە، تەنها پرسيارێکی کردو منيش وەڵامم دايەوە.

چرای ڕووناکی: ژ. ٨.

٥- پرسيار کرا لە پێشەوا (شافيعی) بۆچی زووزوو دەچێتە سەردانی پێشەوا (ئەحمەد)؟ کە قوتابیو دۆستێکی نزيکی پێشەوا (شافيعی) بووە، بەڵام پێشەوا (ئەحمەد) کەمتر سەردانی پێشەوا شافيعی دەکات؟

ئەويش لە وەڵامدا وتی: ئەگەر پێشەوا (ئەحمەد) بێت بۆ لای منو سەردانی من بکات، ئەوە بە هۆی گەورەيیو چاکەکاری خۆيەتی، ئەگەر منيش سەردانی ئەو بکەم، ئەوا هەر لەبەر گەورەيیو چاکەکاری ئەوە.

ديوان الإمام الشافعی: عادل أنور

خوێنەرانی بەڕێز ئەمانە کۆمەڵە وەڵامێکی گەوهەرين، پێدەچێت هەندێجار ئامانج لە پرسيارەکان، يان قسەکان ڕەخنەگرتنو ئاژاوەگێڕی بووبێت، بەڵام کەسی بەرامبەر دەبێت وريا بێت، بە حيکمەتو تێڕامانەوە بدوێتو وەڵام بداتەوە. دەخوازين ئەم چەند نموونەيە جێگای سودو کەڵکی ئێوەی بەڕێز بووبێت.

# بۆچی منداڵان شەڕ و هەرایان دەبێت؟

و: عومەر محەممەد زەڵمی

لەوانەیە هەندێك هۆكاری جیاواز بۆ كێشەی نێوان خوشكو براكان هەبێت، زۆربەی منداڵان پلەیەكی ئیرەییو ڕكەبەریو كێبركێ ئەزموون دەكەن، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی كێشمە كێشمو شەڕوهەراو دەمەقاڵە لە نێوانیاندا ڕوودەدات، تەنانەت توندبوونی ئەو كێشە بچووكانەی منداڵانیش هەر پەیوەندی بەو دەمە قاڵەو شەڕە قسەو هەرا كردنەوەیە، ئەو هۆكارانەش ئەم چەند لقەی لێ جیا دەبێتەوە:

١- پێویستییەكانی منداڵ: گۆڕانكاریو زۆربوونی پێویستی منداڵانو كەسییەتی منداڵ، كاریگەری لەسەر پەیوەندی ئەوانو دەورووبەریان هەیە، بۆنموونە: منداڵی ساوای تازە پێگرتوو حەزو نیاز وخواستو ئارەزووەكانی لە كەلووپەلی یاریكردنو مەمكە مژەو هەندێ شتی لاوەكی لەو بابەتە پێكدێت، هەمیشە پارێزگاری لەو كەلوپەلانەی دەكاتو ئەگەر بێتو یەكێك بیەوێت لێی زەوت بكات، ئەوا بەرگری لەو شتانەی دەكات، شەڕوهەرایان لەسەر ساز دەكات، لەگەڵ خوشك وبرای لە خۆی گەورەتری شەڕی بچووكی مێشوولە ئاسا بەرپادەكات.

منداڵانی تەمەنی قوتابخانە،زۆرتر باوەڕێكی پتەویان بە یەكسانی هاوكاری بەرامبەرەكانیان هەیە، لەوانەیە لەوە تێنەگەن بۆچی لەگەڵ خوشك و براكانی تریان كە لەوان بە تەمەنترن هەڵسوكەوتێكی جیاواز لەو دەكرێت؟!

یان بۆچی جۆرە پارێزگاریویارمەتیدانێكی تایبەت پێشكەش بە ئەو دەكرێت؟

تازەلاوو مێردمنداڵان هەستێكی سەربەخۆی تایبەتو جیاوازیان هەیە، لەوانەیە بەوەی داوای یارمەتیو هاوكاری دەوروبەریان لێ بكرێت دلگران ببن، بە پێی پێویست، بەدەم داواكاری ئەو كەسەوە نەچن، هەموو ئەوجیاوازیانەی منداڵان بە هۆی جیاوازی تەمەنیانەوە، دەبێتە هۆی كێشەو شەڕو ئاژاوەو دەمەقاڵەی نێو منداڵان، لەوانەشە هەندێجاریش لە یەك بدەن.

٢- سروشتی كەسییەتی: سروشتو خوونەریتو سیفەتی تایبەتی هەر منداڵێك، لەوی دیكە جیاوازە، منداڵی واهەیە زۆر هاروهاجە، هەیە مۆنو نەكراوەیە، هەیە ڕووخۆشەو لەگەڵ هەمووان كراوەیە... هتد، ئەو جیاوازیەیان كاریگەری زۆری لەسەر پەیوەندییان بە دەورووبەریانەوە هەیە، بۆ نموونە: ئەگەر منداڵێك خەوتبێتو منداڵێكی تریش خەریكی هاتو هاوارو دەنگە دەنگ بێت، لەوانەیە ببێتە هۆی شەڕی نێوان ئەو دووانە، یاخود جاری وا هەیە منداڵێك خۆی بە دایكو باوكییەوە دەنووسێنێتو ناز دەكات، داوای نازكێشانی زیادە دەكات، منداڵێكی تر كە ئەوە دەبینێت پێی ناخۆشەو دلگران دەبێتو تووشی خەفەتو پەژارە دەبێت و هەست بە كەمیو پەراوێز خستنی خۆی دەكات.

٣- پێداویستییە تایبەتەكانی منداڵی ناساغ: جاری واهەیە بە هۆی پێداویستی تایبەتی منداڵەوە، وەكو ناساغیو كێشەی فێر بوونو سۆزو هەندێ شتی دیكەوە، لەوانەیە منداڵێك پێویستی زیاتری بە چاودێری دایكو باوكی هەبێت، لەوانەشە براو خوشكی تری ئەو منداڵە بە هۆی هەست نەكردنیان بەو گرفتو تایبەتمەندییەی براو خوشكە تایبەتەكەیان، ئەو جیاوازییەی دەكرێت، دلگرانو بێتاقەت ببن، بۆ ڕاكێشانی سەرنجی دایكو باوكیان بۆ لای خۆیان (بە چەشنی برا لارەكانی پەیامبەر یوسف) كارێكی وەها ئەنجام بدەن باشو پەسەند نەبێت، لەوەش ناترسن خوشك، یان براكەیان بەو كارەی ئەوان چی بە سەردێت؟

٤- سوود لە مۆدێلو شتە باوەكان وەرگرن: هەر ئەوجۆرە كردارو ڕەفتارو هەڵسوكەوتانەی كە باوكو دایك ئەنجامی دەدەن، دەبێتە وانەیەكی باش، یان خراپ بۆ منداڵان، كاتێك باوكو دایك لەسەر شتێك هەراو دەنگو بۆڵەیانە، منداڵەكانیشیان تەماشای ئەو حاڵەتەی ئەوان دەكەن، ئەو كارانەیان لێ فێر دەبن، لە كاتی شەڕوهەرای نێوان براو خوشكەكانیان، ئەو جۆرە هەڵسوكەوتانەی لەوان وەریان گرتوون، ئەنجامی دەدەن.

لە كاتی شەڕو هەرادا پێویستە چ كارێك ئەنجام بدەین؟

هەتا دەتوانن‌و بۆتان دەكرێتو توانای كۆنترۆڵكردنی خۆتان هەیە، نزیكی شەڕو هەراو ئاژاوە مەبنەوە، بەشداری لە شەڕو هەرای كەسی تریشدا مەكەن. بەڵام ئەگەر زانیتان تووشی زەرەروزیانی لێدرانو بەركەتن دەبنەوە بەرگری لە خۆتان بكەن.

کاتێک دوو منداڵ تێک دەگیرێن‌و پێکەوە بە شەڕدێن، لەوانەیە لە سەرەتاوە پێیان خۆش بێت، کەسێکی نزیکیان لێکیان جیاکاتەوە، زۆر حەز لە چارەسەرکردنی کێشەکەیان ناکەن، ناشیانەوێت بە دوای چارەسەری کێشەکەیاندا بچن.

مەترسییەکیش لە ئارادایە بە هۆی ئەوەی یەکێك لە منداڵەکان واهەست بکات، دایك و باوکی بە ویست، یان بێ ویست‌و ئاگاداری خۆیان، گرنگی زیاتر بە برایەك، یان خوشکێکی ئەو بدەن. ئەو کارە دەبێتە هۆی دڵتەنگی‌و هەستکردن بە مافخوراوی خۆی‌و دڵ پیسکردن لە دەوروبەرو دەستکردن بە پیلانگێڕان لە دژی براو خوشکەکەی‌و ئیرەیی پێبردن‌و لەوانەشە هەوڵی لە ناو بردنیشی بدات.

ئەگەر بە بەکارهێنانی وشەو قسەی نابەجێ‌و نەشیاوی منداڵەکانتان نیگەران‌و دڵتەنگو قەڵس‌و بێزار دەبن، هەوڵ بدەن خۆتان (دایك‌و باوك‌و براو خوشکی گەورەتر) پێکەوە بە قسەی جوان‌و هەڵسوکەوتی شیرین، ڕەفتارو هەڵسوکەوت‌و مامەڵە بکەن، چونکە بەم کارەتان هەستێکی جوان‌و باش‌و بەرهەمدار، بە چەشنی تۆوی دانەوێڵەو بەروبوومی بەچێژی دار، لە ناخی منداڵەکانتان دەچێنن‌و گەشەی پێ دەدەن. ئەمەش لە دەستێوەردانی شەڕی منداڵان‌و لایەنگری یەکێکیان‌و دژایەتی ئەوی دیکە، زۆر جیاوازترو بە سوودو کەڵك‌و باشترە.

هەوڵی ئەوە مەدەن سەرنجی هەراو شەڕە منداڵەکە بدەن، تا بۆتان ڕوون ببێتەوە کام لە منداڵەکان تاوانبارو دەستپێشخەری شەڕو هەراکەیە؟

دەبێت بزانن هەر دووکیان پێکەوە شەڕەکەیان کردووەو هەردووکیش وەك یەك بەشدارو تاوانبارن.

هەوڵ بدەن بەو شتەی منداڵەکانتان هەرای لەسەر دەکەن، یارییەکی پێ ڕێکبخەن‌و هانیان بدەن لەسەر ئەوەی براوەی ئەویارییەی نێوانیان خەڵاتی سەرکەوتنی پێ دەدەن.

ئەوەش بزانن، منداڵان لە کاتی کێبەرکێ و پێشبڕکێکردندا، فێری چەندین بەهرەی باش‌و بە سوود دەبن، کە لە ژیانیاندا یارمەتیان دەدات، فێری ئەوە دەبن ڕێز لە ڕاوبیروبۆچوونی بەرامبەرەکانیان وەرگرن، هەروەها ئەوەش فێردەبن، چۆن ڕێککەوتن‌و پێکهاتن‌و پێکەوە بوون ئەزموون بکەن، بە چ شێوەیەك بەسەر تووڕەیی‌و هەڵچوونی خۆیاندا زاڵ ببن.

سەرچاوە: گۆڤاری/فضیلت خانوادە
ژمارە٢٣٠/ سەرەتای مانگی٦ی٢٠١٠

شیرین نەجمەدین صدیق

# گەر بە یەکەوە ماڵەکەمان دروست بکەین، زیاتر چێژی لێ وەردەگرین

کاتێك کەوی نێرە دەیەوێت خوازبێنی بکات‌و هاوسەری ژیانی هەڵبژێرێت، دەچێت بۆ لای کەوێکی مێینەو ڕازی دڵی خۆی لا دەدرکێنێت، کەوی مێش پێی دەڵێت: چیت هەیە؟ ئەویش زۆر بە شانازییەوە پێی دەڵێت: وەرە لەگەڵم، پێکەوە لە شەقەی باڵ دەدەن‌و دەڕۆن بۆ ئەو ماڵە خنجیلانەی کە بە هەوڵ‌و ماندووبونێکی زۆر دروستی کردووەو پیشانی دەدات، کەوی مێش لە جیاتی دڵخۆش بوون‌و دەستخۆشی یەکەم کارێك ئەنجامی دەدات ئەوەیە خانووەکەی دەڕوخێنێت، کەوە نێرەکە بە ئارامییەوە دەڵێت: بۆچی ئەم کارەت کرد؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: پێویستە هێلانەکەمان بە یەکەوەو بە هاوکاری هەر دووکمان دروست بکەین، من نامەوێت بێمە سەر خوانی ئامادە، دەمەوێت لە ژیان‌و گوزەرانماندا پێکەوە هاوکار بین، ئەگەر کارە دەبێت هەر دووکمان ماندوو بین، ئەگەر شادییە با هەر دووکمان بە یەکەوە شادمان بین......

زۆرێك لە خانمان ئەمڕۆ بە پێچەوانەوە خانوو ماڵی تەواو مەرجی هاوسەرداریانە، ئەمە جگە لەوەی بارگرانییەکی زۆر دەخاتە سەر شانی کوڕان، ئەم داواکاریانە لە کۆتاییدا کاریگەری نێگەتیفو خراپیشی بۆ سەرشانی خانمان دەبێت، دەتوانین لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆی بکەینەوە:

١- هەرشتێك لە ژیاندا لەگەڵی ماندوو نەبیت، زۆر چێژی لێ نابینیت.

٢- چوونە سەر خوانی ئامادە، تەممەڵی بە دیاری دەهێنێت.

٣- خەون‌و هیواکان، گەر هەوڵ‌و کۆششی خۆمانی تێکەڵ نەبێت، ناتوانین بیانهێنینە دی، ئەگەریش هاتنە دی هەر زوو کۆتاییان پێ دێت.

٤- گەر هەموو شت بەرهەمی هەوڵ‌و کۆششی تەنها یەك لابێت، ئەوا لە کۆتاییدا بەرامبەر وەك میوانێکی نەخوازراوی لێ دێت.

با لە دروستکردندا بەشداربیت گەر بە بیرۆکەو پاڵپشتیش بێت، چونکە ئەو کات تۆش دەبیت بە خاوەنی... هیوادارم خانمان بە خوانی ئامادە ڕازی نەبن، خۆیان هەوڵی دروستکردن بدەن... بۆئەوەی زیاتر چێژ لە ژیانی داهاتوویان وەربگرن...

# 99 ئامۆژگاری بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانت

بەشی دووەم و: حسێن مەحمود هەڵەبجەیی

٢٦- منداڵەکەت پەیوەستدار بکە بە پەروەردگارو پاشان بە پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت)و بە پاداشتی دوارۆژەوە، ئەگەر کارێکی باشی ئەنجامدا پێی بڵێ: ئەوە کارێکە خوای گەورەش پێی خۆشە، ئەگەر کارێکی خراپی ئەنجامدا، پێی بڵێ: خوای گەورە ئەو کارەی پێ خۆش نییە، پێی مەڵێ: عەیبە، یان کارێکی هەڵەیە.

٢٧- منداڵەکەت پەیوەستدار بکە بە بیروباوەڕەوە، پەیوەستداری مەکە بە خۆتەوە، تەنانەت ئەگەر هەڵەیەکت کرد با بیروباوەڕت تۆمەتبار نەکات، بەڵکو بە هەڵەی خۆتی بزانێت.

٢٨-چاودێری زیاد لە سنور بۆ زەلیلکردن، دەبێتە هۆی دروستبوونی کەسایەتییەکی خۆپەرست و لاواز، چاودێری زیاد لە سنور بە هێزەوە، ترسو متمانە بە خۆ نەبوونو ڕاڕاییو دڵەڕاوکێو شەرمنی دروست دەکات، گوێ پێنەدانیش خۆ بە کەم زانینو خۆپەرستیو ڕاڕاییو ڕق لێبوونەوە لە کەسانی تر دروست دەکات تیایدا.

٢٩- نەکەیت زۆر نازکێش بیت، یان زۆر توندوتیژ بیت.

٣٠- گرنگیدان بە خۆراکی منداڵ بە شێوەیەکی تەندروست.

٣١- منداڵەکەت ڕابێنە کە هەمیشە پشت بە خۆی ببەستێت، بەڵام بە بەردەوامی ئاڕاستەی بکە.

٣٢- نابێت بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بەسەر یەکەوە دیار نەبیت لە منداڵەکەتەوەو نەت بینێت.

٣٣- پێویستە ڕەچاوی گەشەی جەستەیی منداڵەکان بکرێت، چونکە کچ کێشی زیاتر دەبێت لە کوڕو کوڕیش باڵای زیاتر دەبێت لە کچ.

٣٤- بە هیچ شێوەیە مەهێڵە سوود لە گۆڤارە ناپەروەردەییەکان ببینن، کە چیرۆکی خەیاڵی ناواقیعیو سیحرو باسی دڕندەو ئەو شتانە دەکەن، وەکو درەختی ژیانو سەندیبادو عەلادینو چرا سەیرەکەو ئەو جۆرە چیرۆکانە.

٣٥- ئەگەر منداڵەکەت دووچاری شتێك هاتو ترساندی یارمەتی مەدە بۆ لە بیرچوونەوەی، چونکە لە بیرکردن لە دەروونندا دەچەسپێت، پاش ماوەیەك دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ دڵەڕاوکێو تێکچوونی دەروونی، بەڵام پێویستە لەگەڵ منداڵەکە ڕێکبکەویتو شتەکانی بۆ ڕوون بکەیتەوە بەو شێوەیەی کە لەگەڵ تەمەنیدا بگونجێت.

٣٦- منداڵەکەت بێبەش مەکە لە شنەی بەرەبەیانو پاشان دانیشتنێکی کەم لەبەر خۆری چێشتەنگاودا.

٣٧- مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵەکەدا زۆر گرنگە: چوونە ڕیزی تەمەنی ئەو و یاریکردن لەگەڵیدا، چونکە ئەوە ڕەوشتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بووە لەگەڵ منداڵاندا.. ئەوە بە قورس مەزانە کاتێك دایك منداڵەکە دێنێت بۆ لات، چونکە دەبێتە هۆی نزیکبوونەوەی منداڵەکە لە تۆوەو ڕات دەهێنێت لەسەر خاکی بوونو سۆزداری.

٣٨- پێویستە ڕەچاوی جیاوازی نێوان منداڵەکان بکەیت.

٣٩- مامەڵە لەگەڵ منداڵەکەتدا بکە کە ئەو ڕۆڵەی تۆیە، هەرچەندە تواناکانیشی زۆر بێت.

٤٠- بە پێی عەقڵو هۆشی قسە لەگەڵ منداڵەکەتدا بکە.

٤١- لە چارەسەرکردنی کێشەکانیدا هاوکاری منداڵەکەت بکە.

٤٢- بە بێ درێژەپێدان ئامۆژگاری منداڵەکەت بکە.

٤٣- هەرگیز لە بەردەم کەسدا ئامۆژگاری منداڵەکەت مەکە.

٤٤- منداڵی عەجول کەسێکی کۆمەڵایەتیو سروشتییە زیاتر لە منداڵێکی هێمن، بۆیە سووربە لەسەر بەهێزکردنیو ئامۆژگاریکردنیو بە خێرایی لێی بێ ئومێد مەبە.

٤٥- با منداڵەکانت جێگای خەوتنیان جیا بێتو لە ژێر یەك نوێندا مەیانخەوێنە.

٤٦- منداڵەکانت فێری پاكوخاوێنی بکە.

٤٧- پێویستە لانی کەم ساڵانە پشکنینی پزیشکی بۆ منداڵەکەت ئەنجام بدەیت.

٤٨- ئاوی گەرمو چەقۆو گوێزانو ئامێری کارەبایی بە تایبەت ئوتوو و پانکە، با لە بەردەستی منداڵەکەتدا نەبێت.

٤٩- پێویستە منداڵەکانت ئەو کارانە ئەنجام نەدەن کە سەرنجی وردی دەوێت، وەکو دەزوو کردن بە دەرزییەوەو خوێندنەوەی پیتی قەبارە بچووكو شتی تر، چونکە دەرکەوتووە لە ٨٠٪ی منداڵان تووشی دووربینی بوون.

٥٠- کاتێك منداڵەکەت پەنا دەباتە بەر گریانو بەخۆداکێشان، داواکارییەکانی جێبەجێ مەکە.

# نامەیەك بۆ هاوڕێیانی خەم

گولان حەمە ئەمین

ئەو کاتەی پۆلێك خەمت بۆ دێتو بە هەڵەداوان خۆیان دەکەن بە نێو ژیانتا، نەخشەی هەموو هەنگاوەکانیان هەڵگرتوویت، خەمێك خۆشەویستانت بەرەو سەفەرێکی هەمیشەیی دەبات، چیدی ڕێگەی ئاوڕدانەوەیەکیشیان لێت نییە، مەگەر تەنها چەند وێنەیەکیان لە خەیاڵتا تۆمار بکات، تۆش جارجارە لە تامەزرۆیی دیدارێکیاندا بەخەونێك پێیان بگەیت.

خەمێکی دی نوقمی هەژاریت دەکات، نزیکە کەسایەتییە بەهێزەکەی ناخت بە لاواز بێتە پێش چاو، خەمێکی دی بلیتی سەفەرێکی دوور وڵاتی بۆ بڕیویتو دەتباتو دەبێت شەوان لە غوربەتی نامۆییدا لە دووری خۆشەویستانتدا قەڵەمەکەت هەڵگریو بە چەند پەیڤێکی حەسرەتاوی گوزارشت لە خەمەکانت بکەیت، پاشان لەبەر شەماڵێکا ئەسرینە تەڕەکانی لێ جیابکەیتەوە، تۆ هێشتا چێژی ژیانت نەکردووە، خەمێك بە سیمایەکی زەردەوە لە دەرگای هەناسەت دەداتو بۆ ماوەیەك دەتکاتە هاوڕێی پزیشکو دەرمانو جێگا، خەمێکی نامۆ دێت کە پێت وایە لەم جیهانەدا تەنها ئاشنایەتی لەگەڵ تۆدا هەیە.

پێش ئەوەی خەمێك بەرێکەی خەمێکی تر دەبێتە میوانتو خەمێکی دیش سەرەی گرتووە، تۆ هەمیشە حەزت لە باخچەی گوڵ دەکرد، بەڵام لە باخچەی خەمە سەوزەکاندا تۆش بوویتە خەمێکی هەمیشەسەوزو هەرکەس بتبینێت بە خەم ئاشنا دەبێت، وانەزانی خەم بێ هێزت دەکات تۆ ئێستا لە هەمووان بە هێزتری، ئێستا هەموو گردو دۆڵە سەختەکانی خەمت بڕیووە، تۆ ئاشنای شەوە تارەکان بوویت، هێندە لە تاریکیدا ڕێت بڕی تا ڕووناکی ڕاستەقینەت دۆزییەوە، هێندە بە ڕێگەی سەختا ڕەوڕەوەی ژیانت گوزەری کردووە، هەمووڕێو ڕێچکەکانت بڕیووە.

زۆرت نەماوە لە دەرگای کۆشکێك بدەیتو بۆ ئەبەد سرودی سوپاسگوزاری تێدا بڵێیت، وامەزانە ئەم خەمانە دوایان خستی لە ژیان، ئەم خەمانە مامۆستا بوون، حەکیمو دانابوون، مەشقو ڕاهێنان بوون، دیاری دەستی پەروەدگار بوون، ویستیان بە دیار گوڵێکی کرچو کاڵو کەم بۆنەوە ڕانەمێنیو بۆنی ڕێحانەیەك مەستت نەکات، ویستیان ڕەنگە لێك ئاڵاوەکان فاڵت نەکات، ویستیان لەگەڵ خۆشەویستانتدا دانەنیشیتو قاقای پێکەنین کاتت نەبات، ویستیان شەوەکانت نوقمی خەو نەبێت.

تاریکییەکانی سەر زەوی بە ڕووناکی ئاسمانیان ئاشنا کردیت، ململانێ لەسەر عەشقت کرا، هەمیشە خۆشەویستان وابوون ململانێیان لەسەر دڵی خۆشەویستانیان کردووە نەیان هێشتووە جگە لە خۆیان کەسی دی لە دڵی خۆشەویستانیاندا بوونی هەبێت، دەی بزانە تۆش بەم لە دەست دانی هەموو خۆشیو خۆشەویستانە خۆشەویستێك هەڵی بژاردووی نایەوێت جگە لە خۆی کەسی دی لە دڵی تۆدا هەبێت، کەواتە خەم مەخۆ پێ بکەنە، تۆ لاوازنیت دەستێك دەستی گرتووی تا بە هیوای بی، بێ هیوا نابی، چەند خۆشت بوویێت هەزار هێندە خۆشی دەوێت.

دەستەکانت لەسەر ئەژنۆکانت هەڵگرەو بەرەو ئاسمان هەڵیانبرە، خەمەکانت لە ناختدا بنێژەو خەندەیەك لە ڕووخسارتدا بچێنە، سەرکەوتووەکان ڕازی نابن لە پێش تاقیکردنەوەدا شکست تۆمار بکەن، هیوات بە بەرزییەك بێ نزمی لە دوا نەبێو کۆتا مەنزڵی سەرکەوتن بێت.

پێش ماڵئاوایی

# گەورەترین سەرکەوتن!!

شێخانی

هەموومان ناپلیۆن پۆناپەرت دەناسین، ئەو مرۆڤەی کە هەموو تەمەنی لە جەنگو کوشتاردا بە سەربرد، دوای ئەزموونێکی زۆرو بە دەستهێنانی زنجیرەیەك سەرکەوتن ئاماژە بە گەورەترین سەرکەوتن دەکات، کە پێویستە هەموومان سوود لە وتەکەی وەربگرین، هەڵبەت دیاریکردنی گەورەترین سەرکەوتن لە لایەن کەسێکی وەك ناپلیۆنەوە گرنگی خۆی هەیە.

ناپلیۆن دەڵێت: گەورەترین جەنگ کە مرۆڤ دەتوانێت گەورەترین سەرکەوتنی تێدا بە دەست بهێنێت، بێ ئەوەی کەس زەرەرمەند بێتو دڵۆپە خوێنێکیش برژێت جەنگی مرۆڤە لەگەڵ دەروونی خۆیداو سەرکەوتنی مرۆڤە بە سەر خودی خۆیدا!!

کەواتە بە بۆچوونی ناپلیۆن سەرکەوتنی مرۆڤ بە سەر خودی خۆیدا زۆر گەورەترە لە سەرکەوتن لە مەیدانی جەنگداو تێکشکاندنی سوپای دوژمنان.

کاتێك مرۆڤ دەتوانێت جڵەوی نەفسی خۆی بکاتو بیخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە دەتوانێت بە سەر هەموو بەربەستەکاندا زاڵ بێتو سەرکەوتن بە دەست بهێنێت. بەڵام کاتێك مرۆڤ کۆنترۆڵی خودی خۆی پێ نەکرێتو بە پێچەوانەوە ببێتە پاشکۆی نەفسو ئارەزووەکانی خۆیو نەتوانێت سەرپێچی بکات، ئەوا بەوپەڕی لاوازیو بێ توانایییەوە ڕووبەڕووی ژیانو ڕووداوەکانی دەبێتەوە، نەفسی مرۆڤ لە بنەڕەتدا ئارەزووی ژیانی بەرسیبەرو تەممەڵیو دانیشتنو پشوودان دەکاتو ئارەزووی لە ناڕەحەتیو هەوڵدانو ماندووبوون نییە، تەنها ئاسوودەیی خۆی مەبەستەو بەس.

بۆیە مرۆڤ دەبێت گوێ بە بەنگەوازی نەفس نەداتو لە خودپەسەندیو خودپەرستیو خولانەوە بە دەوری خودی خۆیدا خۆی ڕزگار بکاتو لەسەر هیممەت بەرزیو ئامانجی بڵندو هەوڵ و تێکۆشان نەفسی ڕابهێنێتو نەبێتە کۆیلەی نەفسی خۆیو تەنها بۆ خۆیو لە سنووری تەسکی ئارەزووە نزمەکانیدا نەژی!!

دەبا بۆ گەیشتن بە سەرکەوتنی گەورە لەگەڵ نەفسی خۆماندا وەها بڕیار بدەین کە لە شتە پۆزەتیفەکاندا بە قسەی بکەینو گوێی بۆ ڕادێرینو بە پێچەوانەشەوە بۆ شتە نێگەتیفەکان سەرپێچی بکەینو بە سەریدا زاڵ ببین.

بۆ نموونە کاتێك دەروونمان بەرگری دەکات لە زوو لە خەوهەستان لە بەرنامەڕێژی، لە بیرکردنەوەی مەنتیقیو ژیرانە، لە بەخشینو یارمەتیدانو هانمان دەدات بۆ تەممەڵیو فەوزاو شوێنکەوتنی کوێرانەی ئارەزووەکانو ڕژدیو خۆشەویستیی پارەو سامان بە قسەی ناکەینو هەوڵ دەدەین لەو دیاردانە ڕزگاری بکەین کە وەکو پەتا تووشی نەفسمان دەبێتو بە هیلاکی دەبەن.

خۆشمان چارەنووسی دەروونی خۆمان دیاری دەکەین، بەو شێوەیەی کە پەروەردەمان کردووە، کاتێك دەروونمان لە ژێر کۆنترۆڵی خۆماندایە دەتوانین بە خۆشەویستیو پاکیو بێگەردیو هیممەت بەرزیو چالاکیو ئاکاری مرۆڤانە ئاوەدانی بکەینەوەو مایەی ئاسوودەیی خۆمانو دەوروبەر بێت، شاعیرێکیش دەڵێت:

والنفس كالطفل إن تتركه شب على
حب الرضاع وإن تفطمه ينفطم